


نیشانە و

هۆکار و

چارەسەر

# دیاردەی ساردبوونەوە لە دین

## نیشانە و هۆکار و چارەسەر


ئامادەکردن و وەرگێڕانی

حەمزە بەرزنجی



## ئەم پەیامە پێشکەشە بە:

❃ سەرجەم موسڵمانان بە گشتی و بانگخوازەکانیان بە تایبەتی.

❃ پێشــکەش بەوانەی لە کێڵگەی ڕابوونی ئیســلامیدا بۆ باکانە شــانیان داوەتە ژێر باری قورسی ئەم کاروانە و گوێ نادەنە شالاّوی لۆمە و دژایەتی و ساردکردنەوە و ترساندن.

❃ بە هەموو ئەوانەی گوێ لە حەق دەگرن و تـامەزرۆن خێرا کـاری پێ بکەن. تا هەنگاوەکانیان شەرعی تر و ئامانجدارتر بێت.



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى أله وصحبه ومن والاه.....

ساردبونەوە لە دین لە دیارترین ئەو دەردە کوشندانەیە کە ئەمڕۆ کۆمەڵگەی موسڵمانانی گرتۆتەوە و ترسناکترین نەخۆشی یە کە توشی تاکی موسـڵمان دەبێت. لەوەش ترسـناکتر ئەوەیە زۆر کەس هەسـتی پێناکات تا کار لە کار دەترازێ و جڵەوی خۆی لە دەســـت دەدات کە ئەو کـات هیچ دەرمانێك تیماری دەردی ناکات.

خوێنەری بەڕێز ئەم بابەتەی بەردەستت گەشتێکی خێرایە بەناو هەندێك لە دیاردە و هۆکار و چارەســەری ئەم دەردە سـاماناکە کە لە چەند وتارێکی دەنگی مامۆســتا (ناصــر العمر ) یەوە وەرگیراوە بەکورتکراوەیی و هەندێ زیادە ڕوونکردنەوەی واقیعی کوردستانی لەمەڕخۆمان........

وە ئەم باسـەش تەنها بۆ ئەو کەسـانە نی یە کە توشی ئەم دەردە هاتوون و بەس، بەڵکو بە تایبەتی ئاراســتەی ئەو کەســانەی دەکەم کە چالاکان لە کێڵگەی ڕابوونی ئیســلامی و بانگەوازی خوایی دا چاپوکانە کار دەکەن لە بانگەوازکار و پەروەردیاران و قوتابیانی زانسـتە شـەرعیەکان و گەنج و لاوان بەگشتی و پاشان بۆ ئەو کەسانەی توشی دەردی ساردبونەوە هاتوون.

ئومێدەوارم ئەم بەرهەمە جێی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت و پاشانیش ڕێبەرێك بێت بۆ بەرە و هەســتانەوە و بە ووزەوە شــاندانە ژێر باری پڕ سەروەری ئیسلام...




# پێناسەی سست بوون و خاوبونەوە (الفتور)



زانایانی پایەبەرز بە زۆر شێواز پێناسەی ووشەی (الفتور) یان کردووە لەوانە:

لە (المختار الصحاح) دا هاتووە: (الفتور) بریتی یە لە ماوەی خاوو لاوازبوون.

ابن کثیر دەفەرمووێ: (المفتر) ئەو مادەیەیە کە ئەگەر خورایەوە لاشە گەرم دەکا و سست و خاوی دەکاتەوە. لەبەر ئەمەشە بە شەراب دەوترێت یەکێکە لە خاوکەرەوەکان. وە هەندێك لەو مادە بێهۆشکەر و سەرخۆشکەرانەی هەندێ خەڵك بەکاری دێنن پێی دەوترێت خاوکەرەوە چونکە لاشە سست و لاواز و بێ هێز دەکات...

راغب الأصفهانی دەفەرمووێت: (الفتور) خاوبونەوەیە دوای چالاکی و نەرم بوونە دوای توندوتۆڵی و لاوازبوونە دوای بەهێزی.

خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾ المائدة: ١٩. واتە دوای ماوەیەك خامۆشی لە هاتنی پێغەمبەرانی خوا عليهم السلام. وە کە دەفەرمووێت (لایفترون) واتە: لە چالاکی پەرستن بۆ خوا خاو نابنەوە و ناوەستن.

ابن منظور دەڵێ: وە کە دەڵێن فلانە شت یان ئاگر یان فلان کەس توشی فتور بوو، واتە خامۆش بوو دوای گەرم و گوڕی و نەرم و خاوبووەوە دوای توندو تۆڵی.

**بەکورتی کەواتە پێناسـەی گشـتی (الفتور)** واتە: تەمبەڵی و خاوو سـست بوون دوای توندو تۆڵی و چالاکی و گورج و گۆڵی.

ابن حجر دەفەرمووێت: وەرس بوون بریتی یە لەسـەر دەرون گران بوون و دوورکەوتنەوەی خەڵکی لێی دوای خۆشـویسـتنی ئەمیش دەردێکە توشی هەندێك لە خواپەرست و بانگخواز و قوتابیانی زانستە شـەرعیەکان دەبێت . بە جۆرێك کەسـەکە لاواز و تەمبەڵ و خاو دەبێتەوە و ڕەنگە وازی لێبهێنێ دوای چالاکی و گەرم و گوڕی، ئەو کەسـانەی توشی ئەم دەردی سـست بوونە دەبن سێ جۆرن:

١. جۆرێکیان خاوبونەوەکە سـەردەکێشـێ بۆ وازهێنانی تەواو لەو شتە کە ئەم جۆرەش زۆرن.

٢. جۆرێکی تریان واز لە کارە چاکەکە ناهێنێ بەڵام کەمی دەکاتەوە کە ئەم جۆرەیان زۆرترن.

٣. جۆری سـێیەم دوای مـاوەیەك خـاوبونەوە گەرم دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە سەر نزیکی حاڵەتی یەکەمی، کە ئەم جۆرە کەسانە زۆر کەمن.

دیارە جگە لەم جۆرانەی (ابن حجر ) بەڕەحمەت بێت بـاسی کرد جۆرێکی تریش هەیە کە توش بووە بەم دەردە تەواو لە ڕێگەی حەق لائەدات و بە یەکجاری دەردی کاری دەبێت. پەنا بە خوا.



# بەڵگە لە قورئان و سوننەتدا

لە قورئان و فەرمودەدا زۆرجار ئاماژە دراوە بەم حاڵەتە بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ:

١- خوای گەورە دەربارەی فریشتەکان دەفەرموێ: ﴿يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفۡتُرُونَ ٢٠﴾ الأنبياء: ٢٠. واتە: شەوو ڕۆژ تەسبیحاتی خوای گەورە دەکەن و لاوازو ماندو نابن.

٢- وە دەفەرموویت: ﴿لَّا يَسۡـَٔمُ ٱلۡإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلۡخَيۡرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٞ قَنُوطٞ ٤٩﴾ فصلت: ٤٩

٣- وە دەربارەی خەسڵەتی باوەڕداران دەفەرموویت: ﴿وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ آل عمران: ١٤٦

٤- وە لە بارەی ئەهلی ئاگر و سزاکەیانەوە دەفەرموویت: ﴿لَا يُفَتَّرُ عَنۡهُمۡ وَهُمۡ فِيهِ مُبۡلِسُونَ ٧٥﴾ الزخرف: ٧٥

٥- وە دەربارەی قەرز نوسین دەفەرموویت: ﴿وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ أَن تَكۡتُبُوهُ صَغِيرًا أَوۡ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦ﴾ البقرة: ٢٨٢

وە ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموویت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مزگەوت و بینی پەتێکی درێژ بەستراوە بە دوو پایە لە پایەکانی مزگەوت لە شێوەی تەناف. فەرمووی ئەم پەت و تەنافە چی یە؟ ووتیان: هی زەینەبە

(خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ماندو لاواز دەبێ خۆی دەدا بەسەریدا .
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (لا حلوا ليصلي أحدكم نشاطه فاذا فتر فليرقد). واتە: نەخێر ئەو پەتە بکەنەوە با هەریەك لە ئێوە کاتی چوست و چالاکی شەونوێژ بکات. خۆئەگەر ماندوبوو با بنوێت.

و عن ابو هريره رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ: (صاحبها سدد وقارب فأرجوه ، ان لكل شيء شرة ولكل شرة فترة فان وان أشير اليه بالأصابع فلا تعدوه).

وە دەفەرمووێت (لكل عالم شرة. ولكل شرة فترة. فمن فتر الى سنتي فقد نجا والا فقد هلك). واتە: هەموو کار و بار و چاکەیەك یان هەموو زانایەك ماوەیەکی گەرم و گوڕی و چوست و چالاکی یەکی هەیە. وە هەموو چالاکیەکیش خاوبونەوە و ساردبوونەوەی هەیە لەپاشی یەوە. جا هەرکەسێك خاوبونەوەکەی بەرەو سوننەتی من بوو وە خۆی چاك کردوە و شەرعیانە بیری کردەوە، ئەوە ڕزگاری بووە و ئومێدتان پێی هەبێ. بەڵام ئەگەر لە شەرع دەرچوو کەوتە حەرامەکانەوە و پەنجەی خراپەی بۆ ڕاکێشرا ئەوە بە هیلاکا چووەو و فەوتاوە.

عائیشە دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە ماڵەوە منیش ئافرەتێکم لەلا بوو فەرمووی: ئەمە کێیە؟ ووتم فلانە ئافرەتە و شەوان هەرگیز نانوێ و شەونوێژ دەکات. ئەویش فەرمووی: (عليكم من الأعمال ماتطيقون فوالله لايمل الله حتى تملوا).رواه البخاری واتە: کار و کردەوەیەك ئەنجام بدەن کە لە تواناتاندایە. سوێند بە خوا خوای

پەروەردگـار وەرس نـابێـت تـا ئێوە وەرس دەبن. جـا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشـەویسـترین کار بەلایەوە ئەوە بووە کە خاوەنەکەی بەردەوام بوایە لە سەری.

وە ابن مسعود دەفەرمووێت: (ان للقلوب شهوة واقبالا وفترة وادبارا. فخذوها عند شـهوتها واقبالها. وذروها عند فترتها وادبارها ). واتە: دڵەکان ئارەزوو، گەرم و گوڕی، هەروەها چالاکی و خاو بوونەوەو پشـت تێکردنیان هەیە، جا لەکاتی ئارەزووی چاکە هەبوون و چالاکی یەکەیدا کاری پێبکەن و لە کاتی سستی و خاوبوونەوەکەیدا لێی گەڕێن و ماندوی مەکەن.



# نیشانە و دیاردەكانی ساردبوونەوە

**١- لە دیارترین نیشـــانەی ســـارد و خاوبوونەوە لە دین بریتی یە لە تەمبەڵی كردن لە خوا پەرســتی یەكاندا:** وەك تەمبەڵی كردن لە نوێژدا هەر لە چوون بەرە و پیری نوێژە بە كۆمەڵەكان تا گەر بشــچێ ئومێدەوارە زوو نوێژەكە تەواو بێت و ئەگەر كەمێك پێشــنوێژ دوابكەوێت یان چەند ئایەتێك زیاد بخوێنێت ئیتر ئەم كەســە هەراســان دەبێت. تەمبەڵی كردن لە خێر و چاكە كردن، خوای گەورە لەبارەی دووڕووەكانەوە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ﴾ النسـاء: ١٤٢، وە دەفەرمـوویـت: ﴿وَلَا يَأۡتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمۡ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمۡ كَٰرِهُونَ﴾ التوبة: ٥٤

ئیتر مەپرســە چۆن تەمبەڵی یەك دەیگرێ بۆ ئەنجام دانی نوێژە ســوننەتەكان و شــەونوێژ و نوێژی چێشــت هەنگاو و ویترەكان و قورئان خوێندن و زیكرخوێندن كە گەورەترین قەڵا و قەڵغانە بۆ مســوڵمان. وە شەیتانیش بەردەوام وای لێدەكات كاتی زیكرەكانی لەبیر بباتەوە و سەرقاڵی بكات بە شــتی ترەوە. كە كاریگەرترین پاڵنەریش بۆ ئەم تەمبەڵی كردنە لە عیبادەتدا بریتی یە لە زۆرخواردن.

ابن الجوزی دەفەرموویـت: زەكەریا پێغەمبەر عَلَيۡهِ السَّلَامُ شــەوێكیان خەبەری نە بووەوە و شــەو نوێژی نەكرد. شــەیتان ووتی: ئایا ئەزانی بۆچی ئەم شــەو شــەونوێژت نەكرد؟ فەرمووی: نەخێر. ووتی: لەبەر ئەوەی زۆرت

خوارد. ئەویش فەرمووی: دەی سا سوێند بەخوا لەمەودوا هەرگیز خواردن زۆرناخۆم پێش خەوتن. شـەیتانیش ووتی : دەمنیش سـوێند بە خوا لەمڕۆ بەدواوە دوای تۆ ئامۆژگاری هیچ کەسێك ناکەم !!.

٢- هەســت کردن بەڕەق بوونی دڵ: بەجۆرێك دڵی ڕاناچڵەکێ لەکاتی خوێندنی قورئان و سەردانی گۆڕستان و مردنی خەڵکی دوای ناشتنی مردوو دەگەڕێتەوە وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێ. بگرە زۆرکەس لەکاتی ناشـتنی مردوودا قسـەی دونیایی و جگەرە کێشـان و پێکەنینیان لێدەبینرێ. ئەمەش بەهۆی زۆری گوناە کردنەوەیە  خوای گەورە دەفەرموویـت: ﴿ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المطففين: ١٤.

وە دەربـارە جـولەکە دەفەرمـوویـت: ﴿ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ ﴾ البقرة: ٧٤

بەڵام ئیماندارانی ڕاســتەقینە کاتێ ئایەتەکانی خوای گەورە دەبیســتن یان یـادی خـوای گەورە دەکەن دڵەکـانـیـان دەلەرزێ. خـوای پەروەردگـار دەفەرموویت: ﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الأنفال: ٢.

٣- هەســت نەکردن بە بەرپرســیارێتی و کەمتەرخەمی کردن لەمەدا:
خوای گەورە ئەمانەتی دا بە ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان  وەریان نەگرت و ئادەمیزاد هەڵی گرت. لەبەرئەوە کەمتەرخەمی لەمەدا یەکێکە لە دیاردەکانی ســاردبوونەوە لەدین و ئەویش شـێوەی زۆرە لەوانە: هەواڵی هەژاری و

دەســت درێژی کردن و پێشـێل کردن و کوشـتن و ئەزیەتدانی موســڵمانان دەبیســتێ لەســەراپای ئەم زەوی یەدا کەچی دڵی ڕاناچڵەکێ و مووی گرژ نابێ...وەك لە بۆسنە لە چیچان لە فلسطین لە ....لە... دەبیستێ و دەبینێ چی ڕوودەدات دەماری ئیمانداریّتی نابزوێ. ئەگەر بشـبزوێ دەسـت ناداتە کاری ئیسـلام و بەردێك ناخاتە سـەر بەردێك و وەکو بینەر خۆی حسـاب دەکات و وادەزانێ ئەو هەموو بێ شـەرعی و بێ ئابڕویی یەی لە وولاتـدا ئەنجام دەدرێ ئەم لێی بەرپرسـیار نی یەو سـزاکەی ئەم ناگرێتەوە. خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ١٦﴾ الإسراء: ١٦

**٤- سـسـت و لاوازبوونی پەیوەندی برایەتی و خۆشـەویسـتی لە نێو موسـڵماناندا:** بەجۆرێ تا دوێنێ کۆمەڵێکی زۆر موسـڵمانی ناسـیوە و کاری لەگەڵ کردون و پەیوەندی هەبووە لەگەڵیاندا کەچی ئەمڕۆ ئەمە نامێنێ و لەجێ ئەو لەیەك وەرسـبوون، پشـت لەیەك کردن، لەیەك بێزاربوون جێی خۆشـەویسـتی و برایەتی دەگرێتەوە. کە ئەمەش بەهۆی زۆر گوناه کردن و یـاخی بوونەوەیە. بەجۆرێ یەکێکیـان یـان هەردووکیـان گونـاه وتـاوانێکی لێدەوەشێتەوە لەبەر چاوی ئەوی تریاندا سوك دەبێت و لەجیاتی تەوبەکردن زیاتر بەرەو یاخی بوون دەچێت و ئەو پەیوەندی برایەتی یە فەرامۆش دەکات و دەبێتە هاوەڵی چەند کەسێکی لەخۆی یاخی تر.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێـت: (ما تواد اثنـان فی اللـه عزوجـل أو فی الأسلام فيفرق بينهما أول ذنب ـــــ وفي رواية: ففرق بينهما الا بذنب يحدث

أحـدهـما). واته: دووكەس نی یە كە لەبەر خوای گەورە یـان لە بـازنەی ئیسلامەتی دا دەبنە دۆست و خۆشەویستی یەكتری و جیاببنەوە ئیلا بەهۆی گوناه كردنی كەسێكیانەوەیە.

**٥- گرنگی دان بە دنیا و سەرقاڵبوون پێوەی:** كە ئەم خاڵە لەمڕۆدا زۆر بەئاشـــكرا دیارە، زۆرێك لە موســـڵمانان ســـەرقاڵیان بە دونیا و ئافرەت و ســـامان و قەســـر و شـــتە ڕازێنراوەكانی دونیا ووردە ووردە لەدین دوری خســـتونەتەوە. بەجۆرێ تەنهـا لە ڕەمەزانـدا بیری دین و دروشـــمە دینی یەكانیان دەكەوێتەوە. دیارە دنیاش شـیرین و سـەوزە و هەموو كەس نازانێ مامەڵەی شـەرعی لەگەڵدا بكات مەگەر كەسـانێك مردن و ڕۆژی دوایی یان هەردەم لەیاد بێ.

**٦- زۆر قســـەكردن بەبێ ئەوەی كارێك بكات ســـودی بۆموســـڵمانان تیابێ:** یان بەكردەوە دەستی كەسانێك بگرێت و ڕێگەیان نیشان بدات . بۆیە دەبینی تەنها باسی كۆن دەكات، هەر خەریكی ڕەخنەگرتنە لەو كەسانەی لە بـانگەوازی ئیســـلامـدا كـاردەكەن. ئیتر چـاوی ڕێگە كوێرەكـان نـابینێ تـا نەشـتەری ئەوانیش بكات و خەڵكیان لێبێداربكاتەوە. وەیان دەبینی بەقســـە هیچی نەهێشـــتۆتەوە بێ ئەوەی بەردێك لەســـەر ڕێگای بەرە و خوا چون لابەرێ. یـاخود بـاسی كـاتی كۆنی خۆی دەكـات و دەڵێ (ئەو كـاتـانەی كە بـانگەوازمان دەكرد...) ئەی ئێســـتـا ؟ ئەی بەیانی؟ چی دەكەیت و لەجێی بانگەوازكار ناسنامەمان چی یە؟ نایزانێ.

## ٧- ڕۆچوون لە گرنگی دان بەخواردن و خواردنەوە و پۆشـاك و ماڵ و سـەیارەدا:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١﴾ الأعراف: ٣١

کە لێرەدا زینەت و خۆجوانکردن باس دەکات بەڵام بەرگری دەکات لە ڕۆچون و ئیسـراف کردن. بۆیە یەکێك لە دیاردەکانی خاوبوونەوە لە دین گرنگی زۆر دانە بەجۆری خواردن و خواردنەوە و کێشـەنانەوە لەسـەری. گرنگی دان بەجل و پۆشاك و ڕواڵەت و پشت گوێخستنی ناوەڕۆك. دەبینی کاتەکانی زۆربەی لەبەر ئاوێنەدا بەسـەر دەبات. گرنگی دان بەخانوو ماڵ و سەیارە، وەك ووتراوە (تبنون القصور وتنسون القبور).

پرسـیاریان کرد لە ابن عقیل الحنبلی کە یەکێکە لە پێشـینان: بۆچی پارچە کولێرە بەووشـکی دەخۆیت و ئاودەکەیت بەسـەری داو نان ناکەیتە ناوشـلەوە بیخۆیت؟ ئەویش فەرمووی: بینیم جیاوازی و مەودای نێوان قوت دانی کولێرە و ئاوخواردنەوە بەسـەری دا لەگەڵ نان خسـتنە ناو شـلەوە جیاوازیان بە ئەندازەی پەنجا ئایەتە، واتە لەخواردنی یەکەمدا ئەو زیادە کاتەم بۆدەمێنێتەوە.

بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ ئەم بیرکردنەوە نەك لاواز بووە بگرە زۆر دەگمەن دەست دەکەوێت. دەبینی پیاوانی موسڵمان زیاد لە ئافرەتان گرنگی دەدەن بەڕواڵەت و لاشەیان.

**٨- نەمانی غیرەت و تورەبوون لەکاتی هەتك كردنی ســنورەكانی خوای گەورەدا:** بەجۆرێ ئولفەتی گرتووە بەو كۆمەڵگا پڕ لەخراپەیەوە و لەكـاتی بینینی خراپەكەدا نـاوچەوان گرژ نـاكـات و دڵی نـابزوێ. كـاتێ دەبینێ بێ ئیمانە بەدین و بەخوای پەروەردگار و بە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و بە هاوەڵان و بە دروشمەكانی دین و بە موسڵمانان، دەكرێت لە كەناڵە بیستراو و بینراو و خوێنراوەكانی كوفرەوە ئەم كەسە هیچ كاریگەری لەسەر دروست نابێ و بگرە زۆرجار لەو شـــانۆگەری و تەمســـیلی یە پێكەنین ئامێزانەوە بێ ئەدەبی دەكرێ كەچی ئەم كەسە پڕ بەدەمی قاقای بێغیرەتی و دەمارسستی لێدەدات و وەك بڵێی ئەم ئەندامێك نی یە لە كۆمەڵگای موســڵماندا. بەناو بازاڕدا ئەگەرێت و ئەو هەموو خراپە و فەسـاد و بێ ڕەوشـتی یە دەبینێ و لە دڵەوە بیر لە دەرئەنجامی سـامناكی ناكاتەوە و ئاهێكی دەروون بەرزی نایەت بەزمانیدا.

**٩- كـات فەوتـانـدن و ســود لێوەرنەگرتنی:** بەجۆرێ ئەوكـاتەی كە سـەرمایەی تەمەنێتی بەسـەردەبات لە هەندێ كردەوەی منداڵانەدا و ئەركە گەورەكەی لە بیر چۆتەوە كە بریتی یە لە نـاســنـامەی (پەرســتنی خوای گەورە) وە ڕۆژ تا ئێوارە بەســەردەبات بۆ ئەوەی چەند ســاتێكی لە ژیانی بە بەرنامە دانابێ بۆ ســوود وەرگرتن لە كتێب و كاسـێت و سـەردانی نەخۆش وســیلەی ڕەحم و بیســتنی حەق و ووتنی حەق ..... هتد. بگرە زۆرێك لەو كەســانە شــەو تـا درەنـگ بەدیـار دوا بـابەتی شـــەو و فلیمە ڕەوشـــت ڕوشێنەرەكانەوە بەسەردەبات ڕۆژیشی بەقسە و گەڕان و كات فەوتاندنەوە

تا کاتێ دەزانێ تەمەن ڕۆیی ..... مردن نزیکبویەوە ..... هەگبەی کۆڵیشـــی خاڵی و بەتاڵ ئیتر ئەم کەسە چۆن سارد نابێتەوە.

**١٠- ئامادە نەبوون بۆ پابەندی بە هیچ کارێکەوە و ڕاکردن لە دەســت هەموو کارێکی گرنگ:** ئەمیش لە ترسی ئەوەی نەوەك بگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی پێشـووی. بەجۆرێ ئەترسـێ وەزیفەکەی، پلەو پایەکەی، دنیای لە دەست بچێت بەهۆی ئەم کارەوە. ئەترســێ خەڵکی لێبتۆرێ، ئەترســێ بەربەسـتی بێتە ڕێ .... ئەترسێ .... لە هەموو شتێ.

**١١- لەســەر هیچ کارێك ڕاوەســتاو نی یە:** لەم کار دەچێ بۆ ئەو کار دەمێك دەعوە دەکات پاشان دەچێتە بەشی زانستە شەرعی یەکان بەڵام زوو وازئەهێنێ و ئەچێتە ڕاگەیاندن. لەویش خۆی ناگرێ دەڕوا بۆ ســەربازی ... هەروەها هتد... بەم شــێوەیە ژیانی لەم ئەم ســەری و ئەو ســەری یدا بەسەردەبات بەبێ ئەوەی لەسەر کارێك خۆی بگرێت.

**١٢- خۆ هەڵخەڵەتـانـدن بەوەی گوایە ســەرقاڵە:** دەڵێ کـارم هەیە کەچی دەستی بەتاڵە. دەڵێ سەرقاڵم کەچی بێکارە، هەردەم خەیاڵی پڕە لە پرۆژەی سـەراب ئاسا، کەچی لە راستیشـدا لە واقیعدا هیچی نایەتە بوون. کەواتە مێشــکی هەردەم ســەرقاڵ و مەشــغوڵە. ئەمیش خۆی دروســتی کردووە بۆ خۆدزینەوە لە کار و بەرەو پیرچوونی.

**١٣-ڕەخنەگرتن لە هەموو کارێکی چاك:** قســە هیچی تێ ناچێت. پاڵی داوەتەوە و تێبینی و ڕەخنەی هەیە لەسـەر هەموو کارێك بێ ئەوەی دەست بداتە ئەو لایەنە لاوازانە و ڕاسـتی بکاتەوە یان بێ ئەوەی بەدڵسـۆزانە تێبینی

یەکانی بگەیەنێتە شوێنی خۆی. بەڵکو مەبەستی ئەوەیە خەڵکانی دڵسۆزی تر وەك خۆی توشی دانیشتن و سست و ساردبوونەوە بکات و هاوڕێی زۆربێ. کە ئەمەش سیفەتی ئەو مونافیقانەیە کە دەیانووت: لە گەرمای هاویندا مەچن بۆ غەزای تەبووك. ﴿وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلۡحَرِّۗ قُلۡ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرّٗاۚ﴾

التوبة: ٨١.

**١٤- شت دواخستن و فەرامۆش کردن و زۆر هیوا و خەون:** چەندان پرۆژە دادەڕێژێ بەڵام لە سەراب! چەندین کار بینا دەکات بەڵام لە خەیاڵ و ئەندێشە. کاری ڕۆژێك لە چەندان ڕۆژدا ئەنجام نادات. کارەکانی بە (تەسویف) بەڕێ دەکات. واتە هەر دەڵێ (سوف) واتە: لە داهاتوودا وادەکەم... بەڵام کەی؟ کاتەکەی نازانرێ. دەڵێ لە قوتابخانە دەرچم ئەوجا وادەکەم؟ نەخێر کە ژنم هێنا؟ نەخێر کە منداڵم بوو؟ ... کاتێ دەزانێ تەمەنی ڕۆیی و هیچی بەهیچ نەبوو لە کاروان بەجێما.



# هۆکارەکانی ساردبوونەوە لە دین

**١- نەبوونی دڵسۆزی لە کاردا:** دڵسۆزی و لەبەر خوا بوون مەرجە بۆ وەرگیرانی هەموو جۆرە عیبادەتێك. هەر کاتێك موسـڵمان مەبەسـتی تری هەبوو لە کارکردندا بۆ ئیسلام، یان سەرجەم کارەکەی لە پێناو شتێکی تردا بوو جگە لە ڕەزامەندی خوای پەروەردگار ئەوا هەر زوو لێی سـارد دەبێتەوە و ئەوانی تریش تاوانبار دەکات بەوەی کە بۆ خوا کارناکەن و هەردەم بە گومانەوە دەڕوانێتە کارە جدیەکان و وەکو کەسی نەخۆش هەموو جۆرە ئاوێکی لەلا تاڵە. یاخود ئەگەر زانی مەرامە نهێنی یەکەی نەهاتە دی لە (ئافەرین، چڵپەی دونیا و سامان، بەرچاوی خەڵك و ڕوپامایی ، پلەو پایە، ناو و شـۆرەت ...هتد) ئەوا هەر زوو بیانویەك دروسـت دەکات و لەو کارە دەسـت هەڵـدەگرێت و بگرە زۆر خراپتر هەوڵ دەدات تەعویزی کاتە فەوتاوەکانی پێشوی بکاتەوە و لە خەڵکی زیاتر باوەش بە دونیادا دەکات.

**٢- کەم شـارەزایی و کەمی لایەنی زانسـتی شـەرعی:** چونکە نەزانی دەردێکە و کەسێك هیچی پێ نەبێ ناتوانێ هیچ ببەخشێ. وە هەر کەسێ شـارەزاتربوو بە شـەرعی خوا ئەوا لە هەموو کەس لە خواترسـترە. خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ﴾ فاطر: ٢٨. وە زۆر لە خواپەرستان سارد ئەبنەوە بەهۆی ئەوەی کەم شارەزان. وە سەختترین کەس بەلای شەیتانەوە زاناکانە.

دەگێڕنەوە: جارێکیان دەست و پێوەندەکانی شەیتان شکاتی حاڵی خۆیان دەکەن که فلانە عابید ئەمان زاڵ نابن بەسەریدا و ناتوانن لە خشتەی بەرن، ئەویش پێیان دەڵێ زاناکان زۆر درەنگتر هەڵدەخەڵەتێنرێن وەك لە عابیدەکان. بۆیە پێشیان دەکەویت و دەڵێت وەرن لەگەڵم و تەماشا بکەن. دەچێتە لای یەکێك لە عابیدە خواپەرستەکان و لێی دەپرسێ: ئایا خوای گەورە دەتوانێ هەموو دونیا کۆ بکاتەوە لە ناو یەك هێلکەدا؟ پاش کەمێك بیرکردنەوە عابیدەکە دەڵێ نازانم، پاشان دەچن بۆ لای زانایەك و شەیتان هەمان پرسیاری لێ دەکات ، ئەویش دوای بیرکردنەوە دەڵێ: بەڵێ خوای گەورە ویستی لەهەر کارێك بێت دەیکات و هیچ بە لای خوا وە گران نی یە. جا شەیتان بە داروودەستەکەی دەڵێ: تەماشا بکەن ئەو عابیدەی چەند ساڵە عیبادەت دەکات کەچی تا ئێستا گومانی هەیە لە دەسەڵاتی بێسنوری خوادا و بەو گومانەی سەرجەم کردەوەکانی خۆی هەڵوەشاندەوە، بەڵام زاناکە خێرا وەڵامی دایەوە. جا کۆمەڵە ئیسلامی یەکان ئەوانەی بە تەمان خەڵکی بەرەو خوا بگێڕنەوە پێویستی لە ئەندامەکانیان لە هەموو کەس شارەزاتر بن لە دین. چونکە ئەوەی هیچی پێ نەبێت ناتوانێ هیچ ببەخشێ. کەسێ خۆی هیچ لە دین نەزانێ چۆن دەعوە دەکات بۆ دین.

**٣- دڵ هەڵواسین بە دونیاداو لەبیرچونەوەی قیامەت :** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (تعس عبدالدينار والدرهم ...) واتە: بە هیلاك چێت بەندەی دینار و درهەم. شەیتان لەم ڕێگەیەوە زۆر کەسی گورج و گۆڵ سارد دەکاتەوە، بۆ نمونە دەڵێت: ئەگەر واز لە بانگەوازکردن نەهێنی وەزیفەکەت، پلەو پایەکەت، خزمەکانت.... لەدەست دەدەیت. ئەویش

وورده ورده ســارد دەبێتەوە و بە دوای بیانویەكدا دەگەڕێت تا دەســت لە كارەكەی بكێشــێتەوە، بەڵام لە ڕاســتیدا پاڵنەری ڕاســتەقینەی وازهێنانی ترسـە لە دەسـت چوونی دونیای. لەبەرئەوە پشـت بە خوا ببەسـتە و وریابە دونیا بوغرات نەكات چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت: (ان الدنیا حلوة خضرة، وان الله مستخلفكم فیها. فینظر كیف تعملون، فاتقوا الدنیا واتقوا النساء). رواە مسلم، واتە: بەڕاستی دونیا شیرین و سەوزە و خوای گەورە كردونییەتە جێنشین تیایدا تا ببینێ چۆن كردەوەیەك دەكەن، دەسا ئاگاداری دونیا و ئافرەت بن.

**٤- تاقیكردنەوە و ئاشوبەی هاوسەر و منداڵ:** هەندێ موسڵمان وای لێ هاتووە تاكاتێ خێزانی نەبێ چوســت و چالاكترە، بەڵام كاتێ هاوســەری پێكەوەنا ئیتر ســەردەنێتەوە و ماڵئاوایی لێ دەكات. لە كاتێكدا هەندێ لە ماڵ و منداڵ دوژمنن بە ئادەمیزاد. وە هاوسەر و منداڵ هەندێ جار نیعمەتە و هەندێ جار كێشـەو نیقمەتە. چونكە هەردەم خەیاڵی لایانە و دەترسێ و خەمێتی لە چارەنوس و پاشــەڕۆژیان، نازانێ چارەنوس بە دەســت خوایە. یەكەم فیتنەی بەنوئیســرائیلیش بەهۆی ئـافرەتەوە بوو. خۆ ئەگەر منـاڵی زۆری بوو ئەوا ئیتر شــەیتان ڕێگە چارەیەكی زۆر پڕ لە فێڵی بۆ دادەڕێژێ و دەڵێ: كاكە تۆ ئیتر ماڵ و مناڵت هەیە و بەرپرسیاری لێیان وازبێنە لە خەڵكی و دەعوە. بە ڕاستی ئەم بیانووە بە ڕووكەش دڵسۆزانەیە گەورەترین دەردە كە خەڵكی بەرەو گومڕایی پـاڵ پێوە دەنێ. چونكە هەموو خـاوەن مـافێك مافی لەســەرتە و پێویســتە مافی هەموو لایەك بدەیت. نە ماڵ و مناڵ فەرامۆش بكە و وســتی بنوێنە لە بەجێ هێنانی پێویســتیاندا. وە نە

بانگەوازی خوا پشت گوێ بخە. چونکە بەڕاستی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ: (الولد محزنة مجبنة مجهلة مبخلة) صحيح الجامع.
واتە: منداڵ خەفەتبارکەر و ترســنۆك کەر و نەفام و نەزان کەر و ڕەزیل و بەخیل کارە.

وە ئەم ســیفاتە حاڵی دووڕوانە یە کە دەیانوت: ﴿شَغَلَتۡنَآ أَمۡوَٰلُنَا وَأَهۡلُونَا فَٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَاۚ﴾ الفتح: ١١، بە ڕاستی ماڵ و مناڵ سەرقاڵی کردوین سا داوای لێ خۆشبونمان بۆبکە.

**٥- ژیان بەســەربردن لەناو کەش و شــوێنێکی فاســیددا:** چونکە چواردەور کاریگەری هەیە لەسەر هەموو ئادەمیزادێك، لە دراوسێی خراپ، هاوڕێ، وولاّت، ناوچەی پڕ لە خراپە. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (المرء على دين خليله فلينظر أحدكم من يخالل). واتە: هەموو کەسێك لەســەر دینی هاوڕێکەیەتی جا بزانن کێ هاوڕێتانە. لەبەر ئەوەی ژیان لە وولاّت و گەڕەك و شوێنێکی پڕ لە خراپەدا گەورەترین هۆکارە بۆ لەدین ساردبوونەوە و هیمەت بەزین. وە ئەو کەســانەی لە هەندەران و وولاّتی کوفردان ئەمە بە چاکی هەست پێ دەکەن .

**٦- هاوڕێ یەتی کردنی هیمەت لاوازەکان:** پێدەچێت ئەو کەســەی هاوڕێیەتی دەکەیت موســڵمان بێت بەلاّم کەم غیرەت و هیمەت لاوازە کە ئەمەش کاریگەری دەبێت بۆ ســەر تۆ و تۆش توشی دەردی گوێ پێنەدان دەبیت. بۆیە موســڵمانان پێویســتە هەردەم هاوڕێی کەســانی چالاك و بەهیمەت بن.

ابن جرير الطبري به قوتابى يەكانى فەرموو: ئايا ئەتوانن تەفسیری قورئانەكەم بۆ بنوسنەوە؟ ووتيان چەند دەبێت؟ فەرمووی: نزيكەی (٣٠) سی هەزار پەڕە. وتيان: ئەی شێخەكەمان بە ڕاستی ئەم كارە تەمەنمان ئەفەوتێنێ و تەواو ناكرێ بۆمان. ئەويش كورت و پوختی كردەوە لە (٣) سێ هەزار پەڕەدا. پاشان فەرمووی: ئايا ئەتوانن مێژووی جيهان بنووسنەوە بۆم؟ وتيان: ئەندازەكەی چەند دەبێت؟ ئەويش نزيكەی ئەو ژمارەيەی فەرموو كە لە تەفسيرەكەدا پێی وتن. ئەوانيش هەمان وەڵاميان دايەوە. بۆيە ئەويش كورتی كردەوە لە كتێبی (تأريخ الأمم والملوك) پاشان فەرمووی: (انا لله.. ماتت الهِمَم).

واتە: انا لله.!! هيمەتی ئەو خەڵكە مردووە.

لەبەرئەوە تەماشا دەكەين ئەگەر ابن جرير وای وتبێ بەو قوتابی يە چالاكانە ئەبێ ئێستا چی بڵێين كاتێ دەبينين لە جياتی دەست خۆشی كردن لە بانگەوازكاران هيمەت لاوازەكان خەڵكيان لێسارد دەكەنەوە و دەڵێن: وازبێنە ئەم كارە ئەنجامی نی يە. چونكە ئەو كەسە بەزيوانە تەنها بەرژەوەندی خۆيان لێك ئەدەنەوە. ئەم كەسانە لە هەر شوێنێكدا بن چواردەوريشيان توشی سستی دەكەن وەكو سێوی گەنيو چۆن سێوە چاكەكانيش بۆگەن دەكات. شاعيريش وتويەتی :

لاتصحب الكسلان في حالاته

كم صالح بفساد أخر يفسد

عدو البليد الى الجليد سريعة

كالجمر يوضع في الرماد فيخمد

٧- گوناه و تاوان و خواردنی حەرام: باکی لە گوناهی بچوك نی یە و خۆی لێناپاریزێ. وەك وتراوە ڕوانینێك، پێكەنینێك، سەلامێك، قسەكردنێك، مەوعید و بەڵێنێك و گەیشتن بەیەك ... پاشان زیناكردنەكە ڕووئەدات .جاری وا هەیە بە بیانوی (ئەیهێنم) و (ئەچمە داوای ) چاوی خۆی بەرەڵا دەكات و خۆی لە هیچ ناشەرعیەك ناگرێتەوە. ووردە ووردە وای لێدێت لەدینداری سارد ئەبێتەوە. هەروەها حەرام خواردن و خۆ نەپاراستن لێی كە ئەمرۆ بۆتە سیمای زۆرینەی خەڵك.

ڕۆژێك خزمەتكارەكەی ئەبوو بەكری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێت) خواردنێكی دەرخواردی ئەبوبەكر دا، ئەویش كاتێ پارویەكی خوارد، خزمەتكارەكە ووتی: ئەی ئەبابەكر لێت نەپرسیم لە كوێوە ئەم خواردنەم پەیدا كرد؟ فەرمووی لە كوێوە؟ ووتی: من لەنەفامی دا فالچی، یان بەخت گرەوە بووم شتێكم لەوە كرد و ئەم خواردنەشم بەو پارەیە پەیدا كرد. ئەبوبەكر زۆر هەوڵیدا تا بڕشێتەوە وتیان: بۆت دەرنایەتەوە مەگەر ئاوێكی زۆر بخۆیتەوە. ئەویش ئاوێكی زۆری خواردەوە و ڕشاندی یەوە! وتیان ئەی ئەبوبەكر خوا ڕەحمت پێ بكات یەك پاروت خوارد پاشان خۆ تۆ نەتزانی كە حەرامە .فەرمووی:(والله لو لم تخرج الا مع روحي لأخرجتها). واتە: سوێند بەخوا ئەگەر دەرنەهاتایە لەگەڵ ڕۆحمدا نەبوایە. ئەوا دەرم دەهێنا !! ئالەبەر ئەم هەڵویستانەیەتی لە ڕۆژی دوایی دا بانگ دەكرێ تا لە كام دەرگای بەهەشتەوە دەیەوێ بچێتە ژورێ.

٨- له بەرچاو ڕۆشــن نەبوونی ئامانج: وەك ئەو کەســەی بانگەواز دەکات یان دەخوێنێ بەڵام نازانێ بۆچی؟ ئامانجی چی یە؟ هیچ ئامانجێکی دیاری نەکردووە بۆ کارەکەی یان بە زۆر پێیان کردووە. یان تێی نەگەشتووە. لەبەر ئەمە هەر زوو وازی لێدەهێنێ و لێی دەکشێتەوە.

٩- کەم بڕوایی بە ئامانج یان وەسیلەکەی: وەك ئەو کەسـەی کارەکە دەکات بانگەوازەکە دەکات بەڵام قەناعەتی پێی نی یە و بە چارەســەری ســەرەکی نازانێ. یان دانیشــتووە و بیر دەکاتەوە لە ناڕەحەتی موســڵمانان پاشـان قەناعەتی بۆ دروســت دەبێ کە ڕزگاربوون نی یە لەم حاڵەتە مەگەر بە بانگەوازکردن بۆ لای خوا. خۆ ئەگەر ئەم کەســە جگە لە ڕێگای دەعوە هەر ڕێگایەکی تر بگرێت لێی سارد دەبێتەوە. هەروەها بۆ شتەکانی تریش لە خوێندنی زانستی شەرعی و جیهادکردن و ...هتد

١٠- نەبوونی (واقیعیەت) لەکاردا: بۆ نمونە توانا و ووزەکانی گونجاو نەبن لەگەڵ کارەکەدا و زیاد لە توانای خۆی دەســت بداتێ. یاخود ڕۆبچێت و ســنور ببەزێنێ لە دیند او هەندێ شــت لەســەر خۆی حەرام بکات کە حەڵاڵە، وەك (نوستن و خواردن و پۆشـاك...هتد) وەکو نمونەی ئەو سێ کەســەی یەکێکیان وتی: هەرگیز ژن ناهێنم، ئەوی تر وتی: هەرگیز نانوم و هەر شەونوێژ دەکەم، سێیەمیش وتی: منیش هەموو ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبم. تا ئەوەبوو پێغەمبەری خواﷺ نەهی لێکردن.

یان لە کارێکدا چاکە بەڵام مافی لایەکی تری خاوەن ماف پێشێل دەکات، بۆ نمونە: گەنجێکی زۆر بە حەماســەت و چالاکە بەڵام کەمتەرخەمە لە

بەجێهێنانی مافی دایك و باوك و كەس و كاری، داوی كەسـیش نەبوە ئەم هەڵەیەی بۆ راسـت بكاتەوە. جا ئەم كەسـانە پاش ماوەیەك هەسـت بە پەشیمانی دەكەن لەو كەمتەرخەمی كردنەیاندا و ووردە ووردە ساردەبنەوە و ئەیەوێ هەقی ئەو هەڵانەی بكاتەوە لە بەرئەوە واز لەكارە خێرەكە دێنێ. یان هەندێك ئامانج و مەبەستی ناواقیعی و موستەحیل و نەگونجاوی هەیە بۆ نمونە: دەیەوێ لە پێنج شـەش ڕۆژدا ئەم واقیعە پڕ لە خراپەیە بگۆڕێ !! یان وەسـیلە و ئامرازەكانی واقیعی نین و ئامانج ناپێكن یان هەنگاوی گەورە و قەپی گەورە دەگرێت و لە كارە گەورەكـانەوە دەسـت پێدەكات. كە لە ڕاسـتیدا هەموو ئەمانە هەڵەن و پێویسـتە موسـڵمان پلە پلەیی لە كاردا ڕەچاو بكات. لەبەرئەوە زانایان دەربارەی وشـەی (الربانيون) فەرموویانە: ئەوكەسـانەن كە پەروەردەی خەڵكی دەكەن لەسـەر ووردە عیلمەكان پێش زانستە قورس و گەورەكان .

١١- بێ ئاگایی لە سـەختی و نشـێوی ڕێگا و بەربەسـتەكان: بەجۆرێ پێشـبینی نـاڕەحەتی و زەحمەتی ڕێگا نـاكـات و خۆی بۆ ئـامـادە نـاكـات و بەتەمـای نی یە. تـا ئەو كـاتەی توشی دەبێ، لەبەرئەوە ئەو كـات ئەژنۆی دەلەرزێو چۆكی دەشـكێ. جا پێویسـتە موسـڵمان هەردەم بزانێ كە ئەم ڕێگایە پڕە لە دڕك و داڵ نەك گوڵ و گوڵزار. پڕە لە تاقیكردنەوە و ناڕەحەتی، برسـێتی، هەژاری، دژایەتی كردن، ئەزیەت دان، كوشـتن، دەربەدەری. كە ئەمەش سـوننەتی خوایی یە و هەموو پێغەمبەرانیش عليهم السلام ژیاننامەیان پڕە لەم خاڵە ئاشكرا و ڕوونانە.

**خـوای پەروەردگـار دەفەرمـوێ:** ﴿الٓمٓ ① أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ② وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ③﴾ العنكبوت: ١ - ٣

**جـارێكيـان داعی يەك زۆر توشی نـاڕەحەتی دەبوو زۆر دەگيرا (نزيكەی حەوت ساڵ زيندانی كرا) لە كارەكەی دەركرا، سزادرا. لێيان پرسی: ئايا لاواز نەبـويـت وخـاونەبـوويـتەوە؟ ئەويـش فەرمـووی: ئەگەر ئەم بەلاَّ و تاقيكردنەوەيەمان تووش نەهاتايە گومانمان بۆ دروسـت دەبوو لە ڕاستی و تەواوی ڕێگەكەمان (چونكە كەسـێك لەسـەر ڕێگای ڕاسـت بێت دەبێ ئەم ناڕەحەتيانە ببينێ ).**

**بۆيە يەكێـك لە هـاوەڵان دەچێتە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ لە كاتێكدا كە لە لای كەعبەدا خواپەرستی دەكرد و شكاتی حاڵی خۆيانی كردو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئايا دوعای سـەركەوتنمان بۆ ناكەيت؟ ئايا بۆمان ناپاڕێيتەوە؟ (تەنها داوای دوعای كرد). بۆيە پێغەمبەری خواﷺ ڕەنگی تێكچوو توڕە بوو فەرمووی: ئێوە چيتان بەسـەرهاتووە. ئوممەتانی پێش ئێوە لەسـەر دين چاڵيان بۆ دەكردن و تێيان دەخسـتن و مشـاريان لەسەر سەريان دادەنا و قاشيان دەكرد، وە بە شانەی ئاسنين گۆشتيان لە ئێسـقان جيادەكردەوە.. بەڵام ئەمە وای لێ نەدەكردن دەسـت لە دين هەڵگرن و پاشـگەز ببنەوە. سـوێند بە خوا خوای گەورە ئەم دينە تەواو و دامەزراو دەكات بە جۆرێ سـوار لە صـەنعاوە دەچێ بۆ حەضـرەمەوت لە خوا نەبێ لە كەس ناترسێ. بەڵام ئێوە گەلێكن پەلەتانە...**

١٢- تاکێتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (وانما يأكل الذئب من الغنم القـاصــيـة). واتە: گورگ لە مەڕی لاڕێو تەرا دەخوات. هەر بۆیە ئەحکامەکانی ئیسلام زۆربەی بە کۆمەڵ ئەنجام ئەدرێ، وەك نوێژ و ڕۆژ و زەکات و حەج و جیهاد و فەرمان کردن بە چاکە و بەرگری کردن لە خراپە و .... هتد.... زۆربەی فەرمانەکانی خوای گەورە ئەمەی لێ وەردەگیرێ وەك: (وتعاونوا).. (واعتصـموا)..(وأقيموا الصـلاة)... واتە زۆربەی لەگەڵ کۆمەڵ ئەدوێ چونکە بە کۆمەڵ بوون سـوودی زۆرە لەوانە: یەکتر گەرم کردنەوە، کەم ســەرف کردنی کات و کاری گەورە ئەنجامدان، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (عليكم بـالجمـاعـة...) وەدەفەرموێ:(من أراد بحبوحـة الجنة فليلزم الجماعة فان الشـيطان مع الواحد وهو من الأثنين أبعد).رواه أحمد والترمزي وصححه الألباني

١٣- وەسـتان لەسـەر یەك شـێواز لە شـێوازەکانی دەعوە و مانەوە لە یەك ئاستی کارکردندا: سروشتی ئادەمیزاد حەزی بەیەك تەوەری کارکردن نی یە بەڵکو مەیلی بەلای گۆڕانکاری و تازەگەری یە بەرە و باشــتر. دیارە ئەم گۆڕانکاری یەش لە بنچینەکانی دیندا نی یە. بەڵکو لە شــێوازی کارکردن و وەســیلەکـانـدایە چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەواوی دینەکەی خوای گەورەی پێ ڕاگەیاندوین و ناتوانین شــتێك بێنینە ئاراوە کە ئەو ئاماژەی پێ نەدابێ. بەڵام شێوازەکانی دەعوەکردن داخراو نی یە و دەتوانرێت گۆڕانکاری و تازەگەری بەپێی پێویســت و لە چوارچێوەی شــەرعدا تێدابکرێت. چونکە گۆڕانکـاری و تـازەگەری یەکێکە لە ســیما بەرزەکـانی ئەم دینە. هەر لەبەر

ئەمەشە خوای پەروەردگار لەسەری هەر سەد ساڵێکدا کەسێك دەنێرێت تا دینەکەی بۆ تازە بکاتەوە و زیادە و هەڵبەستراوەکانی لێ بتەکێنێ. لەبەرئەوە هەرکەسێك لەسەر یەك شێوازی کارکردن بمێنێتەوە ئەوا لێی وەڕس ئەبێ.

**١٤- لادان و ترازان لە ڕێڕەوی کاری ڕاست:** بۆ نمونە سەرەتا کە دەست بەکار دەکات مەبەست و ئامانجەکانی ڕاست و چاك و شەرعیە بەڵام پاش ماوەیەك کارکردن لەم مەنهەجە دەترازێ و ئارەزوو تەنازول کردن و لادان لێی ڕوودەدات. ئەم کەسە پاش ماوەیەك سارد دەبێتەوە. چونکە بێگومان مەنهەجی ڕاستی هەڵگۆزرا و لە قورئان و سوننەت دوورت دەخاتەوە لە خاوبوونەوە و سستی توش بوون .

**١٥- هەست کردن بەململانێ و کێشمەکێش و بەرهەڵستی:** هەر موسڵمانێك هەستی ئەوەی تێدا نەبێت کە ئەم دینە دوژمنی زۆرە و دوژمنانی خوا لێناگەرێن بە ئاسانی تیشکی زێڕینی ئەم پەیامە هەموو کوچە و کەلەبەرە تاریکەکانی مۆڵگەی شەمشەمەکوێرەکان ڕووناك بکاتەوە. هەر کەسێك ئەم هەستەی نەبێت زوو چۆکی دەشکێ و ماندوو دەبێت. چونکە بێ باکانە دەڕوات تا کاتێك هەست بە بەرهەڵستی یەك دەکات خێرا ماندوو دەبێت. ترس و وبێ ئومێدی بەسەری دا دادەبارێ وکۆڵی پێدەدا و چۆکی دەشکێ وەك ئەو کەسەی پێی وایە ئەم واقیعە هیچی نی یە و دنیا بێ گرفتە و چی لە گۆڕێدانی یە... چونکە هەر کەسێك هەست بکات ئەم ئوممەتە کراوەتە نیشانە چۆن سستی ڕوی تێدەکات؟ ئەوکەسەی بزانێ دز هەیە و ئەویش خاوەنی سامانە چۆن بە بێ باکانە دەنوێ؟ ئەو کەسەی بزانێ دوژمنی هەیە

چۆن خۆی غافڵ دەکات !! بەڕاستی هەموو شتێکی ئەم ئومەتە کراوەتە نیشانە و دوژمنانی لە گاور و جولەکە و چڵکاو خۆرەکانیان لە ناوخۆدا لە پیلاندان بۆ لێدان و لێسەندنی دینی، بیروباوەڕی، ڕەوشتی، ئەمنیەتی، ماڵ و سامان و سەروەتی، وە لەو پێناوەشدا کەمتەرخەمی ناکەن و بەماڵ و نەفس و ووزەو توانا دەجەنگن و دەبەخشن: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ﴾ الأنفال: ٣٦ - ٣٧

بەڕاستی زۆر نەفامە ئەو کەسەی دەبینێ و دەبیستێ ئەم ئومەتە خوێنی لێ دەچۆڕێ کەچی پڕ بە دەم قاقا لێبدات، ئایا ئەو پزیشکە چەند گێلە کە کۆمەڵێك کەسی خەتەری هاتۆتە بەردەم کە خوێنیان لەبەر دەڕوات کەچی ئەم خوێن ساردانە مامەڵەیان لەگەڵ بکات.

بۆیە کاتێك نوێنەری ڕۆستەم دێتە شاری مەدینە و بۆ عومەر دەگەڕێ دەڵێن وا لە مزگەوت خەوتوە ئەویش دێت و دەڵێت:(حَكَمتَ فَعَدَلتَ فَأمنتَ فَنمتَ). واتە: حوکمی خەڵکەکەت کرد بە دادپەروەری و ئەمین بووی لێیان بۆیە نووستی. کەواتە سرەوتن نی یە تا بەلیقای خوا گەیشتن .

**١٦- لاوازی پەروەردەیی:** بەڕاستی کەمی لایەنی پەروەردەیی هۆیەکی زۆر گرنگە بۆ ساردبوونەوە. هەر لەبەر ئەمەشە پێغەمبەری خواﷺ سیانزە ساڵ لە مەککەدا هاوەڵەکانی پەروەردە کرد تا بتوانن شان بدەنە ژێر باری قورسی ئەم بانگەوازە. کەمتەرخەمی کردن لەم بوارەدا تەنها تاوانی تاکی

موسـڵمان نی یەو بەس بەڵکو تاوانی سـەرکردە و ئەمیر و پێشـەوایان و بەرپرسانی کاری ئەم ئیسلامەیە، هەروەك چۆن تاوانی زانا و ڕابەرەکانییەتی. لەبەرئەوە جاری وا هەیە کـاریگەری هەیە لەسـەر بەرامبەریش بۆ نموونە: ئەگەر بینیت موسـڵمانێك سـاربوویەوە و سـستی ڕوی تێکرد بپرسـە ئایا تۆ نەبویتە هۆی ئەمەو ئـایا خراپەکـانی کەم پەروەردەیی تۆ ئەو کەسـەی ڕاونـاوە ؟ !.

**١٧- هەڵنەسـەنگاندنی لایەنی ئارەزومەنـدی و بەهرە لەگەڵ کـاردا:**

هەندێك جار بەهرە لێك نادرێتەوە بۆ هەڵبژاردنی جۆری کارەکە. کە ئەمەش وا دەکات ئەو کەسـەی دەست دەداتە کارەکە بێ ئەوەی بەهرەی خۆی بێت یان ئارەزوی لێ بێت پاش ماوەیەك لێی بێزار دەبێت. لەبەرئەوە بەهرەت لەچ بوارێکدا هەیە لەوەدا کاربکە، بەڵام پێویسـتـە بزانرێ کە هەندێك کار هەیە بەڕاهێنان و مەشقکردن ئادەمیزاد لەگەڵیدا ڕایەت و فێری دەبێت. وە واجب و فەرزەکـان نـاخرێتە ژێر ئەم خـاڵەوە چونکە واجبەکـان پەیوەنـدی بە ئـارەزومەنـدی و بەهرەی تـاکەکـانەوە نی یە. لەبەرئەوە هەردەم پێویسـتـە دروشـمی (الرجل المناسـب في المكان المناسـب ) پیاوی گونجاو بۆ شـوێنی گونجاو لە بەرچاو بێت.

**١٨- گۆڕانکاری هاتن بەسەر جۆری باروکەش و تەبیعەتەکاندا:** ئەمیش کاتێك کەسـێك لە بیئەیەکەوە بار دەکات بۆ شـوێنێکی تری بار و زروف و تەبیعەت جیاواز ئەوا بە دەگمەن ئەو کەسە هەمان سیفەتەکانی پێشووی تێدا بمێنێتەوە، چونکە چواردەور کاریگەری هەیە لەسـەر دەرونەکان. خۆ

ئەگەر ئەو شـوێن و جێگایەی بۆی دەچێت جیاواز بێت و کەسـەکانی دەرون بەزیوو هیمەت لاواز بن بێ گومان ئەم کەســەش هەمان شــوێنەواری ئەو کەشەی لەسەر دەردەکەوێت و وردە وردە دەچێتە سەر شێوەی ئەوان.

### ١٩- سەخت و دوور و درێژی ڕێگا و کەمی پشتگیری کار و سەرخەران:

زۆرن ئەو کەسانەی یەکەم هەنگاو لەگەڵ کاروانی بانگخوازان و چاکەکاراندا دەســـت پێـدەکەن، بەڵام زۆر کەمن ئەوانەی تـا مەنزڵ بەردەوامن لە کـاروانەکەدا. وەك ئەو پۆلە بەشــــداربووانەی بەشــداری پێشــبڕکێیەکی (ماراســۆن)ی مەودا درێژ دەکەن، بەڵام کەمیان دەتوانن بگەنە کۆتایی ئەو پێشــبڕکێیە. بۆیە کاتێ بانگخواز ئەم حاڵەتە دەبینێ زۆر جار ماندو دەبێ و بێئومێد دەبێ چونکە دەبینێ ڕێگاکە زۆری ماوە و بەشداربوانیش زۆر کەمن. کەمێکی ئەم کەمەش دڵســۆزن و پشــتگیریکارن و کوڕی ڕۆژی ناڕەحەتی و نەبەزینن. لەبەرئەوە پێویستە هەردەم موسڵمان بۆ چارەسەری ئەم حاڵەتە پشت بە خوا ببەستێ نەك بە مەخلوق، پاشان هەردەم تێشووی پڕو قورس بکات بۆ شــەوە تاریك و دەیجورەکانی دونیا و دوارۆژ، چونکە زۆر پێویســتی بە تێشوو هەیە. وەك ئیمامی شافیعی دەفەرمووێت :

تـزود من التقوى فانك لاتدري

اذا جن الليل هل تعيش الى الفجر

فكم من سليم مات من غير علة

وكم من ســقيم عاش حينا من الدهر

وكم من فتى يمسـي ويصبح آمنا

وقد نســـجت اكفانه وهو لايدري

وكم من عروس زينوها لزوجها
وقد قبضـــت أرواحهم ليلة القدر

٢٠- خەیـاڵ و گریمـان: ئەویش بەوەی هەنـدێـك جـار لە مـاڵەوە دانیشتووە بیر دەكاتەوە ئەگەر كارم كرد، بانگەوازم كرد لەوانەیە ئاوا و ئاوا ڕوودات. بۆ نموونە: تووشی نارەحەتی بێم. نییەتەكەم بۆ خوا نەبێت، هیچم بۆ نەكرێت بە هیچ......، كە هەموو ئەم خەیاڵ و گریمانانە شـتێكی وەهمی و ئەندێشـەین و دوورن لە ڕاستی و خۆ سـەرقاڵكردنە بە زانستێكەوە كە لە سـنوری ئادەمیزاد بەدەرە. ئەمەش سـەردەكێشـێ بۆ وەسـوەسـەو پاشـان بەرەو دانیشـتن و وازهێنانی دەبات لەو كارە. وەك ئەو كەسـەی دەڵێ دەعوە ناكەم نەك خۆم پێ چاك نەكرێت كە ئەمەش دەردە نەك چارەسـەر بەڵكو چارەسەر ئەوەیە ئاگات لە خۆت و خەڵكیش بێت .

٢١- نەخۆشی یەكـانی دڵ: وەك ئیرەیی(حەسـودی) گومـانی خراپ و بوغز و قین و حیزبایەتی. كە هەركەسـێك توشی ئەمانە بێت سـەرقاڵ دەبێت بە مەخلوقەوە و خوای گەورەی لە یاد دەچێ و هەردەم خەفەت و مەراقی زۆر دەبێت و لاواز و بێهێزی دەكات و هەردەم كامەرانە بە ناخۆشی براكەی و خەفەت دەخوات بەشادمانی برا موسڵمانەكەی، بۆیە ووتراوە:

اصبر على مضر الحسود فان صبرك قاتل
النـار يـأكـل بعضها ان لـم تجـد ما تأكـل

**٢٢- ئارەزوە شاراوەكان:** لەسەرسام بوون بەخۆويان حەزكردن لە پلەو پايە و خۆشويستنى خەڵكى و ناو و لەقەبى گەورە لێنان و ڕووپامايى.

**٢٣- كەمتەر خەمى لە پەرســـتشـــدا:** وە لاوازبوونى پەيوەندى لەگەڵ خواى گەورەدا و نەمانى خشوع و كەم بوونى نوێژى سوننەت و بەخشينەكانى ...هتد، چەنكە عيبادەتەكان گەورەترين هۆكارى گەرم و گوڕى و دامەزراوين.

**٢٤- حيزبايەتى و دەمارگيرى:** ئەويش بەوەى تەنها كۆمەڵەكەى خۆى بە ڕاســـت و چاك و پەســـەند لە قەڵەم بدات و هەرچى لەگەڵ ئەمدا بوو پياوچاك بێت لەلاى گەرچى خراپەكاريش بێت. وە هەركەســـێك لەگەڵ كۆمەڵەكەى ئەمدا نەبوو بە هەڵەو لادەر و نەزان لە قەڵەمى بدات ئەگەر چى چاكەكار و خواناســـيش بێت. وە دەمارگيرى هەبێت بۆ كۆمەڵێك يان كەســـێك يان زانايەك يان بانگخواز و ســـەركردەيەك. كە ئەم كارەش سەردەكێشێ بۆ لە سنوور دەرچوون و زيادەڕەوى كردن لە بە چاك زانين بە خراپ زانين و بچوكردنەوەى بازنەى فراوانى ئەم دينە و پارچە پارچەكردنى كۆمەڵى موســـڵمانان. وە پاش ماوەيەك ئەو كەســـە ئەم كارەى خۆى لەلا ئاشكرا دەبێت و هەست دەكات كە هەڵەيە، لەبەرئەوە دەيەوێت تەعويزى كارە هەڵەكەى پێشـــوى بكاتەوە بەڵام بە هەڵەيەكى گەورەدا دەكەوێت بەوەى دەســـت دەكات بە دژايەتى كردنى چاكخوازان و بە حيزبايەتى كردن هەموويان تۆمەت باردەكات. بەڵام پێويســـتە بۆ چارەســـەرى ئەمە كۆمەڵە ئيســـلامى يەكان ئەم هەڵەيە لەلاى ئەندامەكانيان ڕاســـت بكەنەوە بەوەى شـــەرع بكەنە پێوانەى هەڵســـەنگاندنى هەموو كەســـێك وە پاشـــان

ئەنـدامەکـانیش لە خوارەوە ڕێ لەم نەخۆشی یە  کوشـــنـدەیە بگرن کە سەرەنجامەکەی بە دانیشتنی ئەو ئەندامە و لەکەدارکردنی سیمای ڕابوون و بانگخوازان لە دنیاد او شەرمەزاری بەردەم خوای پەروەردگار کۆتایی پێدێت.

**٢٥- پشت گوێ خستنی هەڵەکان و بەهانە بۆ هێنانەوەی و ئامۆژگاری یەکتری نەکردن و بە ئاشکرا دەرنەخستنی هەڵەی بەرامبەر:** کە ئەم هەڵانە ســـەردەکێشـــێ بۆ ئەوەی کە کەس وەڵامی ئامۆژگاری ئامۆژگاری کاران نەداتەوە  و گوێ نەدات بە بانگەوازی دڵســـۆزان و گوێ نەگرێ بۆ ڕاســـت کردنەوەی هەڵەکان. ئەوســـا زەلیلی و زەبونی دەبێتە بەشی ئەو کەســـە یان ئەو کۆمەڵە چونکە هەرکەسێك وەك ئاوێنە بە دڵسۆزی و ئەدەبەوە هەڵە و کەم وکوڕیەکـان بخـاتە ڕوو پێویســـتە ڕێزی لێ بگیرێ نەك بە نەزان و ئاژاوەچی و فەوزەوی لە قەڵم بدرێت و ڕاوبنرێت. چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (المؤمن مرأة المؤمن). پاشـــان هەموو مرۆڤێکیش خاوەنی هەڵەو ناتەواوی یە.

**٢٦- نەچەســـپان لەســـەر هیچ بەرنامە و کارێك:** بۆ وێنە ئاشـــنایی لە کارێکدا پەیدا دەکات و پاشـــان وازی لێدەهێنێ  و تەواوی ناکات و دەچێتە ســـەر کارێکی تر. تا وردە وردە پاش ماوەیەك و وزەکانی بە هەدەر دەدات و لاوازو سست دەبێت .

**٢٧- ڕا جیـاوازی لە نێوان قوتـابیـانی عیلم و کێشـــمەکێش لەنێوان بانگخوازاندا:** کە ئەم خاڵەش پشـــتی بانگخوازان دەشـــکێنێ و دڵەکان ڕەق دەکات. هەردەم دڵیان پڕدەکات لە ئێش و ژان و پاشـــان ئەم ڕقە دەبێتە

گومان و ئارەزوو زاڵ دەبێت بە سەری داو ڕیزی موسڵمانان دەشێوێ و لە جیاتی ڕێز و خۆشەویستی و هاوکاری، بانگخوازان سست و تەمبەڵ دەبن و متمانەیان بە کارەکە لەلا کەم دەبێت و هەر کەسەو لەجێی خۆی لێی دادەنیشێ .

**٢٨- گومان دروست کردن لەلایەن دووڕووەکانەوە:** کە ئەمەش زۆر جار کاریگەری قورسی هەبووە لەسەر دەرونەکان ئەویش شێوازی زۆرە لەوانە: چاوگێڕان بۆ هەڵە و گەورەکردنی و زۆر دووبارە کردنەوەی وە قسەکردن لەبارەی نیەتەوە، درۆ و بوختان کردن، بە جۆرێ کەسی عاقڵ و ژیر دۆش دادەهێنێ و گێژی دەکات، بەردەوام درۆ دەکەن تا خەڵکی ساردبکەنەوە. هەندێ لە کەسە چالاکەکان دادەنیشن و خۆشی و بێوەیی هەڵدەبژێرن تا سەلامەت بن. کارە گرنگ بەهاو سەنگینەکەیان دەگۆڕنەوە بەشتێکی سوك و بێ بەها. خۆ ئەگەر ساغ بوونایە لەگەڵ خوای خۆیاندا ئەوا دەبوایە لە ئاست درۆ و دەلەسەی ئەو دەغەڵ و دووڕوانەدا بیان ووتایە: (حسبنا الله ونعم الوكيل).

**٢٩- بێ ئاگایی لە سونەتەکانی خوای گەورە لە نەتەوە و کەسەکاندا:** ئەگەر ئادەمیزاد شارەزا بێت بە بەسەرهات و سەرەنجامی کاری ئوممەتان و بەردەوامی ململانێی نێوان هەق و بەتاڵ و ژیاننامەی پێغەمبەران عليهم السلام ئەوکات بە ڕوونی حیکمەتی بوونی نارەحەتی و ناسۆری بۆ دەردەکەوێت کە چی یە، وە حیکمەتی ئەو دیاردانەی بۆ دەردەکەوێت کە دەیانبینێ و دەیانبیسێ. خوای گەورەش دەفەرموویت: ﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن

قَبۡلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ﴿٦٢﴾ الأحزاب: ٦٢. وە بەناڕەحەتی و کێشـە چۆکی ناشکێ. بەڵام ئەگەر بێ ئاگا بوو لەمە ئەوا گومانی تێدا نی یە زوو دەڕمێ .

٣٠- تەماشـاکردنی ئەو کەسـانەی لە خوار خۆتەوەن لە تاعەت و پەرستش و بانگەوازدا: سروشتی ئادەمیزاد وایە ئەگەر تەماشای کەسی لە خۆی گورج تر بکات خۆی بە کەم دەبینێ و هەوڵدەدات چاو لەو بکات، خۆ ئەگەر بە پێچەوانەشـەوە تەماشای کەسێکی نزم تر لە خۆی بکات لە ڕووی عیبادەت و چاکەخوازی و هەق وتنەوە ئەوا ئەمیش سـارد دەبێتەوە و سستی دەنوێنێ بە تایبەتی ئەگەر ئەو کەسەی ئەم سەیری دەکات خاوەنی عیلم و ناو و شۆرەت بێت، ئەوا زیاتر ئەم کەسە بوغرا دەبێت و ئەو دەکاتە بەڵگە کە گوایە بۆ ئەو فلان کاری نەکرد یان فلان تاوانی ئەنجام دا. ئەگەر ئەو لە بەرچاونەما دەنیشێ بە کەسێکی سست ترەوە، وە هەر بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت تا وای لێ دێت کەس حەز بە بینینی ناکات و دەڕوخێ و دەکەوێت و هەرگیز بەرە و پێش هەنگاو نانێ. وەك وتراویشە:

ومن يتهيب صعود الجبال

يعش أبد الدهر بين الحفر

٣١- کەسـێك بکەوێتە ناو تاوانێکەوە شـەرمەزاری بەردەم هاوڕێیانی بکات: کە ئەمەش بە پێچەوانەی خاڵی پێشووەوەیە ئەو کەسەی کە ووتمان خەڵك چاوی لێ کرد ئەگەر خۆی بینیەوە لەناو تاوانێکدایە و کەسـانی تر چاویان تێوەی بوو بە تایبەتی ئەگەر ئەو تاوانە زۆر گەورە بوو لە حەقیدا، ئەوا دەڕوخێ و ڕوشـکاو دەبێت و خۆی کەنارگیر دەکات. لەگەڵ ئەوەی

هەموو کەسێك شایستەی هەڵە لێ ڕودان و گوناە کردنە. چارەسەریش بەوە دەبێ هاوڕێکانی دڵ نەوایی بکەن و داوای تەوبەی لێ بکەن تاپەشیمان ببێتەوە و چاکە ئەنجام بدات چونکە چاکە خراپە دەسڕێتەوە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ﴾ هود: ١١٤ وە بیری بخەنەوە کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: (کل بنی أدم خطاء وخیر الخطائین التوابون).

**٣٢- کەم تەرخەمی و سستی نواندن لە چارەسەرکردنی سستی و خاوبونەوە:** ئەگەر کەسی تووش بوو خێرا بە دوای دەرمانەکەدا گەڕا ئەوا زوو فریای خۆی دەکەوێت و لێی قورس ناکات و زوو شیفای بۆ دێت بە ئیزنی خوا. بەڵام ئەگەر پشت گوێی خست و کەمتەرخەمی نواند ئەوا ئەگەر دەسیشی بداتێ کاتێکی زیاتری پێویستە تا دێتەوە ئاستی جارانی وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: (ان لکل شيء شرة ولکل شرة فترة فان صاحبها سدد وقارب فارجوه وان أشیر الیه بالأصابع فلا تعدوه).

واتە: هەموو کارێك چالاکی و گورج و گۆڵی هەیەو هەموو چالاکی یەکیش سستبونەوەی هەیە. خۆ ئەگەر ئەو کەسە بەپێی شەرع ڕۆشت و خۆی نزیك کردەوە بە چاکەکردن لەو ساردی یەدا ئەوا ئومێدتان پێی هەبێت، بەڵام ئەگەر بە خراپە پەنجەی بۆ ڕاکیشراو سنوری بەزاند ئەوا بەتەمای مەبن و حیسابی زیندوی بۆ مەکەن ئەوە لێ بۆتەوە.



# چارەسەر

دوای ئەوەی هەندێك لە دیاردەو هۆكانی ساردبونەوە لە دینمان خستە ڕوو هەركەس لەجێی خۆیەوە لە میانەی ئەو نیشانانەوە لای ئاشكرا دەبێت تا چەندێك خۆی و چواردەوری گیرۆدەی ئەم دەردەن. بۆیە هەوڵدەدات كە چارەسەری دەستكەوێت چونكە بێ گومان كەسێك ناتوانێ سوود لە چارەسەر وەربگرێت ئەگەر هەستی بە سامناكی ئەم نەخۆشی یە نەكردبێت و خۆی بە نەخۆش دانەنێ، وە لە میانەی نیشانە و هۆكانەوە ڕاستەوخۆ دەتوانین چارەسەر بدۆزێنەوە بە بێ باس كردنی بە سەربەخۆیی. چونكە بە خۆ پاراستن چارەسەر بەدی دێت، بەڵام ئێستا بە كەمێك ووردتر چەند خاڵێكی چارەسەر باس دەكەین:

**١- بەردەوام چاودێری كردنی ئیمان و تازەكردنەوەی:** گەورەترین بەربەست و ڕێگر لە ساردبوونەوە و خاوبوونەوە لە دین بریتی یە لە بەردەوام ئاگابوون لە ئیمان و تازەكردنەوەی، چونكە ئیمان بەردەوام لە بەرز بوونەوەو نزم بوونەوەدایە بۆیە هەردەم پێویستی بە تازەكردنەوە هەیە نەكو زیانی پێبگات و گەورەترین سەروەتت لەدەست بچێت. وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾ النساء: ١٣٦ وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت: (ان الأيمان ليخلق في جوف أحدكم كما يخلق الثوب، فاسئلوا الله ان يجدد الأيمان في قلوبكم ). رواه الحاكم، واتە:

ئیمان و بڕوا كۆن دەبێت لە هەر یەكێكتاندا هەروەكو چۆن پۆشـــاك كۆن دەبێ. جا لە خوای گەورە بپاڕێنەوە كە ئیمان لە دڵەكانتاندا نوێ بكاتەوە.

بۆیە هاوەڵان كە بەیەك دەگەیشتن دەیانوت:( تعال بنا نجلس نؤمن ساعة)، كەواتە مەجلیس و دانیشـتنەكان پڕبكرێت وە لە یادی خوا و باسی عیبادەتەكان نەك شتی دونیایی.

**٢- هەســـت كردن بە چـاودێری خوایی بەســـەرتەوە و زۆر زیكر و یادكردنی:** پێشـــینانی خواناس زۆر یادی خوای پەروەردگاریان دەكرد و لێی دەترسان و ئومێدیان پێی هەبوو وە خۆشیان دەویست. بۆیە جارێك یەكێك لە ســـەلەف دەچێتە بـازاڕەوە لەبەر خۆیەوە یـادی خوا دەكـات و زیكر دەخوێنێ. پیـاوێك گوێی لێ دەبێ دەڵێ: ئەرێ كـابرا تۆ شـــێتی؟! ئەویش دەفەرموێ:(لا یا أخي هذا دواء الجنون). واتە: نەخێر برا ئەم زیكرە دەرمانی شێتی یە.

بۆیە بەردەوام بوون لەسەر هەست كردن بە ئاگا لێبوونی خوایی و خوێندنی زیكرەكـان بە گشـــتی وە بە تـایبەتی قورئـان خوێنـدن گەورەترین پارێزەرە بۆ زۆربەی دەردەكـان وەك: شـــێتـی و دڵەڕوكـێ و خەفەت و نـاڕەحەتی و ســـاردبونەوە كە ئەمرۆ ئەمـانە لە هەموو كـات زۆرترە.... خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨

**٣- دڵسۆزی (الأخلاص) و تەقوا و زانینی ئەو پاداشت و فەزڵەی خوای گەورە ئامادەی كردووە بۆ ئیش كەران:** بۆ ئەوانەی لە كێڵگەی كاری دەعوە و تێگەیاندنی خەڵكی دا كاردەكەن. چونكە هەركەســـێك مەبەســـتی بۆ خوا

بووه له خوا دەترسا به ئومێدی پاداشتی بەهەشت ئەوا لا ناكاتەوه بەلای باق و بریقەكانی دونیاداو هەرگیز نایگۆڕێتەوه به كالآ گرانبەهاكەی بەهەشت.

٤- پاكردنەوەی دڵ: پاكردنەوەی دڵ له ژەنگ و ژاری گوناهه پەنهانەكان چاكترین هۆكاره بۆ ئاسودەیی و شادمانی و گەرم و گوڕی، لەو گوناهانەش به تایبەتی حەسودی(ئیرەیی). ئیمامی ئەحمەد له مەسنەدەكەیدا هێناویەتی كه جارێكیان پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئێستا پیاوێك لەم دەرگایەوه دێته دەرەوه له ئەهلی بەهەشتە. ئەوەندەی پێنەچوو كابرایەك هاتەدەر ریشی ئاوی لێدەتكا. بۆ ڕۆژی دواتر به هەمان شێوه فەرمووی: ئێستا پیاوێك له دەرگاوه دێته دەر له ئەهلی بەهەشتە، پاش كەمێك هەمان پیاوی دوێنێ هاته دەر. بۆ رۆژی سێیەم هەمان شتی فەرموو هەمان كابرا هاته دەرەوه. بۆیه عبدالله كوڕی عەمری كوڕی عاص گەنجێكی به گوڕ بوو فەرمووی: ئەم پیاوەی كه پێغەمبەری خواﷺ سێ جار شایەتی بەهەشتی بۆ دا ئیلا ئەبێ چاكەیەكی گەورەی هەبێت كه ئەنجامی دەدا و ئێمه نایزانین. بۆیه كاتێ كابرا رۆیشت عبدالله شوێنی كەوت تا ماڵەوه و له دەرگای داو پێی فەرموو: ئەی مامه من لەگەڵ باوكم دەمه بۆڵەیەكم بووه بۆیه ئەمەوێ لەلات بمێنمەوه تا باوكم دڵی باش دەبێتەوه. ئەویش فەرمووی: أهلا وسهلا

عبدالله دەفەرموێ: چەند ڕۆژێك لەگەڵی مامەوه هیچ زیاده نوێژ و ڕۆژوو عیبادەتێكم لێ نەبینی له خۆمان زیاتر. بۆیه پێم ووت: ئەی مامه له ڕاستیدا

من هیچ کێشـەیەکم لەگەڵ باوکمدا نەبووە، بەڵام گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ سێ جار شایەتی بۆ دایت کە تۆ لە ئەهلی بەهەشتی، بۆیە منیش حەزم کرد هۆکەی بزانم بەڵام کە تەماشــام کردیت هیچ زیادە نوێژ و ڕۆژوویەکم لێت نەبینی. ئەویش فەرمووی: ئەی برازای خۆم هەر ئەوەیە کە بینیت و هەر ئەوەندەم هەیە. بەڵام خاڵێکی تریش شــك دەبەم ئەویش هەر کاتێ دەچمە سـەر جێگای نوسـتنم و وەردەگەڕێمە سـەرلایەکی ترم یادی خوای پەروەردگارم دەکەم. پاشان فەرمووی: وە هیچ شەوێکم لێ نەڕۆیشتوە کە لە دڵمدا ڕق و کینێك هەبوو بێت بەرامبەر موسـڵمانێك. عبدالله فەرمووی: (هذه الذي أدخلتك الجنة) دەسـا ئەم سـیفەتە وای لێکردویت لە ئەهلی بەهەشت بیت.

کەچی لەمڕۆدا لە جیاتی پێشبڕکێ کردن لە سەر خێرو چاکە، دەبینی ڕق و حەسـودی و کینە لە نێوان هەندێك لە خەڵکیدا سـەری هەڵداوە کە ئەم ڕقە بووەتە هۆی دوژمنایەتی کردنی یەکتری و سـەلام لەیەك نەکردن. بۆیە پێویسـتە وەك خوای گەورە فێرمان دەکات هەردەم بڵێین:﴿وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ الحشر: ١٠

**٦- گرنگی دان بە مەنهەجی وەرگرتن و کـارکردن بەپێی قورئـان و سـونەت:** چونکە هەرکەسـێك لەسـەر ڕێڕەوێکی هەڵە کاربکات و پاش ماوەیەك بۆی ڕوون دەبێتەوە کە لەسـەر هەڵە ڕۆیشـتوە ساردەبێتەوە و تووشی هیلاکی و ماندوبوونی دەرونی دەبێت و پەشـیمانە لەو تەمەنەی کە لێی ڕۆیی.

**٧- شارەزابوون لە واقیع:** لەو واقیعە تاڵەی چواردەورمان کە ئەمەش تێگەیشتنە لەو هەموو پیلانەی کە بەدەست دوژمنانی ئیسلامەوە دەیبینین ئەو دوژمنەی کە لە پێستی خۆمانەو بە زوبانی خۆمان دەدوێ. چۆن تووشی ساردبونەوە دەبێ کەسێك کە شارەزابێت بە برینداری ئوممەتی ئیسلام؟. کە دیارە هەموو ئەو بەڵاو کێشانەی ڕۆژانە دێتە ڕێگامان پێویستی بە شارەزایی بوون هەیە لە هۆکارەکانی دروست بوونی، خۆپاراستن لێی، چارەسەری... تا نەمانڕوخێنێ و چۆکمان پێ دانەدا و بزانین چۆن مامەڵەی حەکیمانەی لەگەڵدا دەکەین و چارەسەری دەکەین لەو کات و شوێنەدا. چونکە ابن القیم لە پێناسەی حیکمەتدا دەفەرموویێت:(الحکمة هي فعلماینبغي کما ینبغي في الوقت الذي ینبغي). واتە: دانایی بریتی یە لە ئەنجامدانی ئەو کارە شەرعیەی کە پێویستە بەو جۆرەی کە پێویستە لەو کاتەی کە پێویستە.

**٨- میانڕەوی (الوسطیە):** مامناوەندی گرتن لە هەموو کارێکدا لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلامە چونکە بریتی یە لە خۆپاراستن لە تێپەڕاندن و بە زایەدان. وە میانڕەوی شەرعیانە بریتی یە لە لوتکەی چاکێتی. چونکە میانڕەوی لە دەعوەدا بریتی یە لە دانی مافی خوای پەروەردگار و دانی مافی کەس و کار. میانڕەوی لە کارکردندا بریتی یە لە نێوانی خاو و خلیچکی و تەمبەڵی و زۆر خۆ پڕوکاندن. میانڕەوی لە بەخشیندا بریتی یە لە نێوانی ڕەزیلی و دەست بڵاوی. هەر لەبەر ئەمەشە هەردوو خاڵەکەی ئەملا و ئەولای لە شەرعدا بێزراوە. ئەوەتا جارێك کابرایەك دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پارچەیەك ئاڵتونی هێناوە تا بەدیاری پێی ببەخشێ، ئەویش ڕووی لێ وەردەگێڕێ. بۆیە دەچێتە بەردەمی و جارێکی تر ڕووی لێ

وەردەگێڕێ. تا لای سێیەمەوە دەچێتەوە ڕووبەڕوی دەوەستێ و پێغەمبەری خوایش ﷺ لێی وەردەگرێ و فڕێی دەدات، هـاوەڵەکە دەفەرموێ: ئەگەر بەر سـەری بکەوتایە دەیشـکاند. پاشـان فەرموی: (يأتي أحدكم بما يملك ثم يقعد يقول لو أنني ولو أنني...). واتە: یەکێـك لە ئێوە دەچێـت چی هەیە دەیهێنێ و پاشــان بە دەســتی بەتاڵ لە ماڵەوە دادەنیشــێ پەشــیمانی دەردەبڕێ و دەڵێ ئەگەر من ئەمەو ئەوەم هەبوایە .....

لەبەرئەوە مـامنـاوەنـدی کردن لە هەموو کـارێکـدا و بەپێی شــەرع ڕۆیشــتن چاکترین پارێزەرە لە ســاردو خاوبونەوە. چونکە ئادەمیزاد وا لێ دەکات خۆی لە دوو ئەمســەر و ئەوســەری خراپ بپارێزێت. نە خۆی زۆر هیلاك و ماندوو بکات و مافی خۆی و لاشــەیی و خێزان و کەس و کاری پێشــێل بکـات، نە وای لێ دێت خۆپەرســت بێـت و خەمی دەوروبەرو واقیعەکەی نەخوات.

**٩- ڕیکخســتنی کاتەکان و لە خۆپرســینەوە:** چونکە لە خۆپرسـینەوە چاکردنی لایەنە خراپەکـان و بەهێزکردنی لایەنە چـاکەکـانە. ئەویش بەوەی لە خۆت بپرسیتەوە چەند کاتت بە فیڕۆداوە و شەوان لەسەر جێگا چاوێك بەناو تۆماری ئەو ڕۆژەتدا بگێڕی و ســەرزەنشــتێکی نەفســت بکەیت. کە چاکترین و گرنگترین سـوودی ئەم کارە پەشـیمان بوونەوە و تەوبەکردنە لە تاوانەکانی ئەو ڕۆژەت کە بەمەش لە گوناهەکانی خۆت کەم دەکەیتەوە. وە ســودێکی تری پاراســتنی ئەو کاتەیە کە دەســتمایەی تەمەنمانە و گرنگی پێدانێتی. دەگێڕنەوە (ابو البركات) باپیری شیخ الاسلام ابن تیمیة (ڕەحمەتی

خوایان لێبێت) کاتێ بچوایەتە حەمام بۆ خۆشـۆردن کوڕەکەی بانگ دەکرد و دەیفەرموو: ڕۆڵە لەلای دەرگـاکەدا دابنیشـــە و کتێبێکم بۆ بخوێنەوە و دەنگـت بەرز بکەرەوە. ئەویش لەبەر ئەوەی لە نـاو گەرمـاوەکەدا لەبەری بکات. جا سەرنج بدە ئەو پیاوچاکانە نەیانهێشتووە ئەو کاتانەیان لە دەست دەرچێت. ئا بەمە گەشتبوونە پلەی چێژ و لەزەت وەرگرتن لە عیبادەت.

ابن القیم دەفەرموێ: نەفس وەك شاخێکی بەرز و سەخت وایە کە بە سـەریدا سـەردەکەویت، شـەیتان دەڵێ: نەکەیت ناتوانی بیبڕیت و تۆ هێزی ئەمەت نی یە. بەڵام کـاتێ گەشـــتیتە لوتکەکەی ئیتر دەگەیتە پلەی چیژ و لەزەت وەرگرتن لە عیبادەت و قورسی ئەو عیبادەتە لەسەر شانت نامێنێ .

**١٠- پابەندبوون بە کۆمەڵەوە:** چونکە لە وەســیەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ حوزەیفە کە پرسی لە کـاتی بەڵاو فیتنەو ئـاشــوبدا چی بکـات فەرمووی: (تلزم جماعة المســلمین وامامهم). واتە: پابەنـد بە بە کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواکەیانەوە. چونکە شەیتان لەگەڵ یەکەو لە دوو دوورە. وە هەر کەســێك بمرێت و لە کۆمەڵی موســڵمانان دووربێت بە نەفامی دەمرێ.

جا ئەم کۆمەڵەش مەبەسـت پێی مانا فراوانەکەیەتی ئەویش کۆمەڵی ئەهلی ســوننە و جەماعەتە کە بریتی یە لە کۆمەڵی ڕزگاربوان و دەســتەی سـەرخراوان وە زۆر فراوانترە لەو کۆمەڵە تایبەت و سـنوور تەسـکانەی کە ئەمانیش هەر لە ئیسلامدان مادام کارێکیان لێ نەوەشێتەوە کە بەو کارە لە ئیســلام دەربچن. وە پابەندبوون بە کۆمەڵ و تێکەڵاوبوونیان وا دەکات کە

براكانی ئاگایان لێی بێت و یارمەتی بدەن و پێشـبڕكێی چاكەی لەگەڵدا بكەن و كە لاواز بوو دەسـتی بگرن و نەیەڵن بكەوێ. وە دەبێ موسـڵمان ئاگای لەوە بێ هێشتا كاتی خۆ كەنارگیركردنی شەرعیانە نەهاتووە، تا بڕواتەوە بۆ مـاڵ و قەپ بكـات بە بنجی دارەكەدا كە لە فەرموودەدا ئـامـاژەی پێكراوە. پێویسـتە بێتە مەیدان و دەسـتێكی هەبێت لە ئیصـلاح و چـاكەخوازی و گەڕانەوەی كۆمەڵگا بەرەو شەرع.

١١- یارمەتی دان و بە هاناوە چوونی كەسـە سـاردبووەكان: موسـڵمان وەك چۆن دەبێت خەمخۆر بێت بۆ كەسانی نەفام و لاڕێو دەیەوێ بیانهێنێتە سـەر ڕێ. دەبێت چەندان جار بە پەرۆش تر بێت بۆ ئەو كەسـە موسـڵمانە دڵسـۆز و چاكەكارەی كە ئێسـتا تووشی سـاردبوونەوە بووەو دەبێ خێرا دەسـت بداتە ژێر باڵی و هەڵی بسـێنێتەوە، ئەویش بە بچوك كردنەوەی هەڵەكانی لەبەر چاویداو سـەردانی كردنی و بێ ئومێد نەبوون لێی. چونكە لەوانەیە ڕۆژێك بێت خۆشی تۆش تووشی هەمان دەرد ببیت. لەبەرئەوە لە دەست دانی ئەو كەسە خاوەن ئەزمون و كۆنانە لەدەست دانی دەسكەوت و سـامـانێكی زۆر گەورە و گرانبەهـایە. یەكێـك لەو هەڵانەی هەنـدێك لە موسڵمانان ئەنجامی ئەدەن و هەستی پێ ناكەن بریتی یە لە قسە دابڕین و سـەردانی نەكردن و گەورەكردنی گوناهەكەیی و باس كردنی و سـومعە زڕاندنی. لەبەرئەوە پێویسـتە هەردەم موسـڵمان بەسـەرهاتی حاطەبی كوڕی ئەبی بەلتەعەی لەبەرچاو بێت كە كاتێ ویستی هەواڵێك بگەیەنێتە قورەیش و خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ لێ ئـاگـاداركردەوە و بـانگیان كرد و عومەر فەرمووی: ڕێم بـدە بـدەم لە گەردنی ئەم مونـافیقە، فەرمووی: تۆ چوزانی

عومەر ئەمە بەشـــداری بەدری کردوە و خوای گەورەش فەرمویەتی چی دەکەن بیکەن لێتان خۆش بووم...

هەروەها دوای ئەوەی براکانی یوسـف عليه‌السلام ئەو هەموو خراپەیان لەگەڵ یوسـف کردو بە منداڵی دوای لێدان و هەڵدانە بیرێکەوە فرۆشـراو تووشی تاقی کردنەوەی قورس و زیندانی کردن بوو، هەموو بەهۆی خراپی براکانی یەوە. بەڵام لە کۆتایدا داوای لێبوردنیان لێکرد ئەویش فەرموی: (لاتثريب عليكم اليوم يغفر الله لكم......).

١٢- **پەروەردەیەکی گشـتگیری تەواو:** ئەویش بە خۆ پەروەردەکردن و پەروەردەکرنی نەوەیەکی چاك لەسـەر بەرنامەیەکی گشـتگیری تەواو بە ڕەچاوکردنی هەموو لایەنەکانی ئیسـلام، هەر لە عیبادەت و زانسـت و طاعەت، تا هەموو بوارەکانی تری ئەم دینە. وە یەکێك لە هەڵە دیار و زەقەکانی هەندێك لە کۆمەڵە ئیسـلامی یەکان بریتی یە لە گرنگی دان بە لایەنێك لە لایەنەکانی ئیسـلام و فەرامۆش کردنی لایەنەکانی تر کە ئەمەش وا دەکات زۆرێك لەو ئەندامانە هەسـت بە ناتەواوی بەرنامەکەیان بکەن و تووشی سـاردبوونەوە ببن. لەبەرئەوە پێویسـتە هەموو لایەنەکانی ئەم ئیسـلامە هەق و سـەنگی خۆی بدرێتێ لە پەروەردەو پاکردنەوەی دەرون و بانگەوازو جیهاد و ڕاگەیاندن و.....هتد.

١٣- **جۆرا و جۆرکردنی پەرستش و کار:** ئادەمیزاد سروشتی بە جۆرێکە حەزی بە گۆڕانکاری و جۆرا و جۆرکردنی کارە. بۆیە لە ئیسـلام دا لەگەڵ فەرزەکاندا کۆمەڵێك سوننەتی هەمەچەشن هەیە کە ئادەمیزاد وا لێدەکات

لەزەتی زیاتر لە فەرزەکان و عیبادەتەکانی وەرگرێت و ئەگەر لە دانەیەکیان بێتـاقەت بوو دانەیەکی تریـان جێبەجێ دەکـات و بەم جۆرە هەردەم لە خێرەکەدا دەمێنێتەوە. هەر لەبەر ئەمەش بوو پێغەمبەری خواﷺ هەموو ڕۆژێك ووتاری بۆ هاوەڵان نەدەدا تا سـستی و بێتاقەتی ڕویان تێنەکات و وەڕس نەبن.

عبداللەی کوڕی مەسعود هەموو پینج شەممانێك ووتاری بۆ هاوەڵانی دەدا. پیاوێك ووتی: ئاواتم دەخواسـت کە خۆزگە هەموو ڕۆژێك شـتت بۆ باس دەکردین. ئەویش فەرموی: بۆیە واناکەم ئەترسـم وەڕسـتان بکەم. منیش جـاروبـار ووتـارتـان بۆ دەدەم هەروەك چۆن پێغەمبەری خواﷺ جاروبار ووتاری بۆ ئێمە دەدا لە ترسی ئەوەی نەکو وەڕس و بێتاقەت ببین /متفق علیه.

**١٤- پێشـەنگی چاك:** بوونی کەسێکی پێشـەنگ و قیدوە لە مامۆستا و زانا و شارەزایانی هاوچەرخ وا لە موسڵمان دەکات هەردەم بە گوڕ بێت وچاو لەو پیاوانە بکـات. لەبەرئەوە پێویسـتە موسـڵمـان هەردەم بە دوای ئەو کەسـانەدا بگەڕێت و هاوڕێیەتیان بکات و لە گەڵیاندا بژی و لەوان ئەزمونی دین ودنیا فێر بێ. هەروەها کۆمەڵگەی چاکیش گرنگی و کاریگەری هەیە. لەبەر ئەم خـاڵەش دەبینین هـاوەڵان و تـابیعی و تـابیعی تـابعین لە هەموو چـاخەکـانی تر پڕخێرتربوون چونکە نزیکتربون لە سـەرچـاوەی وەحی و پێشەوای مرۆڤایەتی یەوەﷺ .

ئەحمەدی موفتی زادە دەفەرموێ: تەماشای هاوەڵانم کرد لەگەڵ ئێمەدا هیچ جیاوازی یەکم بەدی نەکرد کەوای لەوان کردبێت بەوچەشنە خۆفیداکاری ئەم دینەبوون جگە لە دووشت:

یەکەم: ئەوان پێشەنگ و مامۆستاکەیان پێغەمبەر بووﷺ .

دووەم: قوتابی یەکان بریتی بوون لە هاوەڵان کە هەموو گیانیان کردبوو بە دڵ بۆ وەرگرتنی ئیسلام و پەخشکردنی بەسەر ڕوی زەویدا.

وە سیدقطب دەفەرموویێت: جیازی ئێمە و هاوەڵان ئەوەیە ئەوان بە یەکجاری دەستیان لە نەفامێتی هەڵدەگرت و نەدەگەڕانەوە سەری، وە گوێگرتنیان بۆ کارپێکردن بوو. وە ئیسلامیان بە گشتگیری وەردەگرت.

١٥- هیمەت بەرزی و چاوبڕینە ئامانج و کۆشین بۆی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ و فەرمووی: من ئەمەوێت لە بەهەشت دا هاوڕێت بم. ئەویش فەرموی:(أعني على نفسك بكثرة السجود) واتە: سا پشتیوانیم بکە بۆ خۆت بە زۆر سەجدە بردن. لەبەرئەوە کەسێك مەبەستی بەرزی هەبێت پێویستە شەونخونی بۆ بکات. بۆیە جارێکیان پیاوێکی خەواڵوی زۆر حەز بە خەوکەری سست بە یەکێك لە زانا بەرزە دیارەکان دەڵێت: ئەمەوێت وەکو تۆم لێ بێت. ئەویش پێی دەفەرموویێت: (أأبيت سهران الدجى وتبيته نوما تبغي بعد ذاك لحاقي). واتە: ئایا من هەردەم شەوان بێدار و بەخەبەرم و تۆش شەو بەسەر دەبەیت بە خەوێکی قوڵ و پاشان ئەتەوێت پێم بگەیتەوەو وەك منت لێبێت!!

لەبەرئەوە ئێمە مەبەســـتەکەمـان زۆر لەوە بەرزتر و گەورەترە کەبۆی بخەوین ئەو مەبەســـتەش بریتی یە لە ڕەزامەنـدی خوای پەروەردگـار و بەهەشت.

بڕوانە کەســـێکی گەنج دەیەوێت ژن بهێنێ چۆن بۆی تێدەکۆشـــێو هەردەم خەیاڵی لای ئەو کارەیە و بەپەرۆشـە بۆی. کە ئەمە شـتێکی دونیایی یە ئەی چۆن موسـڵمان نابێ چەندان قات زیاتر هەوڵ و پەرۆشی بەهەشـت بێت. شاعیریش دەڵێ :

بقدر الكد تكســــب المعالي

من طلب العلى سهر الليالي

١٦- زۆر یادکرنی مردن و ترسـان لە عاقیبەت خراپی: وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: ( أكثروا ذكر هازم اللـذات) واتە: زۆر یـادی لەزەت پچڕێنەکە بکەن کە مردنە.

وە هەر کەسێك یادی مردن بکات سێ شتی پێ دەبەخشرێ:

١. زوو تەوبەکردن.

٢. قەناعەتی دڵ و دەروون.

٣. چالاکی لە عیبادەتکردندا.

وە هەرکەسێك مردن لە بیر خۆی بەرێتەوە توشی سێ سزا دەبێت:

١. دواخستنی تەوبەو پەشیمان بوونەوە.

٢. ڕازی نەبوون بە کەم.

٣. تەمبەڵی لە عیبادەت کردندا .

پێویســته موســڵمان ئاگاداری ئەو فەرموده بێت كه پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ( كەسی وا هەیه كار به كردەوەی ئەهلی بەهەشــت دەكات تا نێوان ئەم و بەهەشـــت به ئەنـدازەی بـاڵێكی دەمێنی له كیتابەكەی دا نوســـراوه وەردەگەڕێ پاشــــان كرداری ئەهلی دۆزەخان دەكات و دەچێته ناوی.....) پەنا بەخوای گەوره... بۆیه هەردەم ئـاگاداری ئەوه بین نەكو به موســـڵمانێتی نەبێت و بمرین و پەیمانێكی وا ببەســـتین و بدەین به خوای خۆمان كه هەردەم لەسەر ڕێبازی ئەو بین و به شوێن پێغەمبەری ئەو ﷺ بكەوین .

**١٧- ئارامگرتن:** خوای گەوره له باسی ئەهلی بەهەشـتدا دەفەرموێ: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ٢٤﴾ الرعد: ٢٤. كەواته ئـامگرتن پاداشـــتەكەی بەهەشته. وه دەفەرموێ: ﴿إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ١١١﴾ المؤمنون: ١١١

**١٨- ڕەخنه له خۆگرتن وچاوگێڕان به كردەوەكاندا:** چونكه به گوێگرتن لەو كەســـانەی ڕەخنەی بنیاتنەر دەگرن و هەڵەكانمان دەخەنەڕوو زیاتر بەرەو چاك بوون و پاك بونەوه دەچێن و ڕاســـت دەبینەوه لەبەر ئەوەی ئادەمیزاد به تەواوی خۆی ناناســێ وەك ئەو كەســەی بەرامبەری دەیبینێ. لەبەرئەوه پێویستمان به یەكتری یه .

**١٩- تێڕوانین له ژیانامەی پێغەمبەران:** كه چۆن تێكۆشــان و ئارامیان گرت. بۆنمونه نوح پێغەمبەر عليه السلام نۆســـەدو پەنجا ســـاڵ تەنها خەریكی

بانگەواز و ئیصــلاح بووە. ئەم تەماشــاکردن و لێوردبوون و خوێندنەوەی ژیـاننـامەی ئەوان چـاکترین پـاڵنەرە بۆ پەروەردە کردن و چـالاك کردنی موسڵمان چونکە ئادەمیزاد سـروشـتی وایە لاوازی و مەلەل ڕوی تێدەکات. جا لەم کاتەدا پێویســتی بە پێشــەنگێکی چاکە تا چاوی لێ بکات. ئەی ئەو کەســانە کێن کە ئەم پێویســتە چاویان لێبکات؟ ئەویش پێغەمبەرانە عليهم السلام چـونکە خـوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ﴾ الأنعام: ٩٠

٢٠- پـاڕانەوە: ئەویش عیبـادەتێکە مەخلوق تیـایـدا لاوازی خۆی بۆ خـالقی دەردەبڕێ. چونکە هەر ئەو شــایســتەی لێپاڕانەوەیە. وەك خۆی دەفەرموێ: ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلۡمُضۡطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكۡشِفُ ٱلسُّوٓءَ﴾ النمل: ٦٢

وە هەر ئەوە شـایسـتەی وەڵام دانەوە و بەهاناوە هاتنە. کە ئادەمیزاد هەردەم پێویسـتە بۆ گشـت کارێکی تەنها لە خوای پەروەردگار بپاڕێتەوە. جا چۆن موسـڵمان کاتێ توشی موسـیبەتێك دەبێت لە ژینی دا دەپاڕێتەوەو هانا بۆ خوا دەبات. ئەوا چەندین جار زیاتر پێویستە کاتێ توشی بەڵاو موسیبەتێك دەبێت لە دینی دا یان توشی دەردەداری دین کزبوون دەبێ پێویســتە زیاتر بپاڕێتەوە. چونکە پێ دەچێت موسـیبەتی لاشـە و ژین بەخێر و چاکە کۆتایی بێت و بەخێر بۆت بنوسـرێت گەر ئامگریت. بەڵام موسـیبەتی دین بەو جۆرە نی یە. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێت: (ان الأيمان ليخلق في جوف أحدكم كما يخلق الثوب, فاسئلوا الله أن يجدد الأيمان في قلوبكم).

بەڵام  بەداخەوە زۆر برا لەم ڕۆژەدا دوعای فەرامۆش کردوە و سستی تیادەکات و بە بیانوی ئەوەی دوعا گیرا نابێت. کە ئەمە خۆی بۆ خۆی یەکێکە لە هۆکانی گیرا نەبوونی پاڕانەوە  و نیشانەیەکی خراپە. چونکە هەر کەس لە خوا نەپاڕێتەوە خوای گەورە لێی دەرەنجێ. جا ئێمەش عەبدێکی لاوازین و گەر لە خوای پەروەردگار نەپاڕێینەوە کێ هەیە فریاد ڕەسمان بێت لەم هەموو تەڵە  و تەنافی جاڵجاڵۆکانەی لەم سەردەمەدا تەنراوە. بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ﴾ الزمر: ٣٦

ئیمامی عومەر ( ڕەزای خوای لێبێت )  دەفەرموێ:  (والله اني لا أحمل هم الأجابة  ولكني أحمل هم الدعاء).  واتە: سوێند بەخوا من خەفەت ناخۆم و خەمی گیرانەبون و وەڵام نەدانەوەی پاڕانەوە هەڵناگرم،   بەڵام خەمی نەپاڕانەوە هەڵدەگرم .



لە کۆتایی دا هیوادارم ئەم بابەتە بە باشی بخوێنینەوە و هەوڵ بدەین سەرجەم ئەو هۆکارانە بگرینە بەر کە دەبنە هۆی گەرم بوونەوە و واز لەو خاڵانە بهێنین کە فاکتەری سارد بوونەوەن.

